# الزناد في شرح

# لمعة الإعتقاد

داناني

پێشەوا موفق الدين أبي محمد عبدالله بن أحمد بن قدامة

رحمه اللّه

(٥٤١-٦٢٠)

شەرحی

شێخ علي بن خضير الخضير

وەرگێڕانی

سيف اللّه السني

١٤٣٩هـ

## پێشەکی وەرگێڕ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ، أما بعد :**

بەهۆی نامۆیی ئیسلام و نامۆیی هەڵگرانی پەیامەکەی دەبینین خەڵکێکی زۆر لەزۆربەی بوارەکـانی دیـن و بیروبـاوەڕ تێکەوتـوون بەڕادەیەك کەبەشـێکی کەم لەموسـڵمانانان بیروبـاوەڕێکی دامەزراو و لەسـەر ڕێبـاز و تێگەیشـتنی سـەلەف ( پێشـینی ئوممـەت ) یـان هەبێـت لەزۆربەی بوارەکـانی بیروبـاوەڕدا وەکـو الـولاء والبـراء و حـاکمیەت و کـوفرکردن بەطـاغوت و و یەکلاییکـردنەوەی پەرستشـەکان تەنهـا بـۆ الله تعـالی ، گومـانی تێـدا نیـیە لەپاڵ نامۆبوونی ئەو بوارانەی بیروباوەڕ کەباسمان کرد بیروباوەڕی ( الأسماء والصفات ) وە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەمـاعە لەزۆربەی بوارەکانـدا نـامۆیەکی زۆری بەخـۆیەوە بینیـوە بەڵکـو دەتـوانین بلێـین لەزۆربەی بنچینەکـانی تـری ئەم دیـنە نـامۆیی زیـاتری پێوەدیـارە بەشـێوەیەکی گشـتی وە بەتـایبەت هەڵوێسـت و واجبمـان بەرامـبەر نـاو و صـیفەتەکانی الله تعـالی دەبینـین کە هەتـاوەك ئەو کەسـەی لەزۆربەی بوارەکـانی تـری لەسـەر بیروبـاوەڕێکی تەواو و دامەزراوە و ڕێبـازی ئەهلـی سـوننە و جەماعەیـە بەڵام کە دێـتە سـەر باسـەکانی نـاو و صـیفەتەکانی الله تعـالی ئەوە لەوەیـان دەکەوێـت و ئەگەر نەشکەوێت ئەوا شـارەزاییەکی تەواوی نیـیە لەبـوارەکەدا بـۆ نمـوونە دەزانێـت الله تعـالی صیفەتی دەستی هەیە بەڵام نازانێت بەهەمان شێوە ئەو صیفەتانەی تر کە پەیوەستن بە دەستەوە وەك پەنجەکان و نینۆکەکان و ناو لەپ .....هتد نایزانێت ، وە لەوانەشە زۆرجار ببێـتە هۆکـاری ئەوەی کە نکـۆڵی لەو صـیفەتـانە بکـات یـان تەئویلی بکـات پەنـا بە الله ، لەدوایشدا جگە لە هیلاکی دین هیچی تری بۆ نەمێنێتەوە ، وە پێویستە بزانین کە وەك چۆن تەوحیدی ڕبوبیەت دامەزراو نابێت و تەنها پێی نابیتە موسڵمان ئەگەر تەوحیدی ئولوهیەتـت هەڵنەگرتبێـت و نەتبێـت بەهەمـان شـێوە ئەگەر بەهەردوو جـۆرەکەی تەوحیـدیش هاتبیـت و لەخـۆت دا جێگیـرت کردبێـت بەڵام ئەگەر تەوحیـدی ( الأسماء

والصفات ) ت نەبێت ئەوا موسڵمان نیت ، بۆیە پێویستە لەسەرمان وەك چۆن فێری تەوحیدی ئولوهیەت دەبین و هەولی جێگیرکردنی ئەو بنچینە مەزنە لەخۆمان دەدەین ، بەهەمان شێوە هەوڵبدەین و تێبکوشین و هەوڵی جێگیرکردنی ئەو تەوحیدە بدەین کە شۆڕش و تێکۆشانێکی زۆر گەورە و مەزنی لەسەر کراوە هەر لەکاتی پێشینانمان تاوەکو ئەو سەردەمی خۆمان لە ئەهلی سوننە و جەماعە بەرامبەر ئەهلی بیدعە لەجەهمیەکان و ئەشعەریەکان و مشبیهەکان و نمونەبۆهێنەرەوان و مفوضەکان ، بۆ ئەوەی نەبێتە هۆکارێك بۆ ڕەتکردنەوەی صیفەتەکانی الله یاخود تەئویل کردنی یاخود وێکچواندنی یاخود نموونە بۆ هێنانەوەی ، بۆ سەرفراز بوون لەدونیا و قیامەت ئەوە واجبە لەسەرمان شارەزای بوارەکان و لایەنەکانی تری ئەو باسە ببین ، بۆیە ئەوە گەورەیی و گرنگی ئەم بنچینە مەزنە بۆیە دەبینین زۆرێك لەسەلەف دەفەرموون : ( هەموو گەلێك و کۆمەڵەیەك دەزانن کە چی و کێ دەپەرستن تەنها جەهمیەکان نەبێت ) ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە دانیان نەدەنا بە ناو و صیفەتەکانی الله تعالی دا ، وە گومانی تێدانییە کە نوسەر باسی زۆربەی بوارەکان و بنچینەکانی تری ئەهلی سوننە و جەماعەی کردووە لەباسەکانی پێغەمبەری الله ( صلى الله علیه وسلم ) و ئیمان و ئیمان بەنادیارەکان ، وە هەڵوێست و واجبمان بەرامبەر هاوەڵان و خێزانەکانی پێغەمبەری الله ( صلى الله علیه وسلم ) ، بەڵام ئەوەی زیاتر پێی لێ داگرتووە بریتییە لە باسی ( الأسماء والصفات ) بەشێوەیەك کە زۆر پێداگری لێکردۆتەوە هۆکارەکەشی ئەوەیە کە ڕوونکەرەوەی ڕووناکیەکە باسی کردووە ، وە کە سەیرم کرد بینیم یەکێکە لەچاکترین ڕوونکردنەوەکانی ئەو کتێبە ، وە ڕوونکەرەوەی بەشێوەیەکی زۆر جوان و چاك کتێبەکەی ڕوونکردۆتەوە کە هەندێك وە هۆکاری هەڵبژاردنم بۆ وەرگێڕانی ئەو ڕووناکی بیروباوەڕە و ڕوونکردنەوەی شێخی زیندانی کراو الله ئازادی کات دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك یەکێ لەوانە کارە گرنگەکانی شێخە لە چۆنیەتی ڕوونکردنەوەی کتێبەکە ، هەندێك لەکارەکانی لەسەر کتێبەکە :

1_ شێخ بەرگری لە نوسەر و هەندێك لە ئەهلی زانست وەك بوخاری کردووە سەبارەت بە نوسەر ئەوەی لەهەندێك وتەی دا تایبەت ئەو وتەیەی کە دەفەرموویت : لەو شتانەش کەناڕوونی و و ئیشکالیەتی لەسەرە بریتیە لەوەی واز لەواتاکەی بهێندرێت کە لەوانەیە ئەو وتەیەی وەك ڕوونکەرەوە ئاماژەی پێدا تفویضی لێ وەرگیرێت بەڵام ڕوونکەرەوە ئاماژەی بەوەداوە کە وتەکەی دروستە و بەوتەی تری ڕوونی کردۆتەوە کەنوسەر ئەو مەبەستەی نەبووە لەوە ، وە وەك ئاماژەدان و ڕوونکردنەوەیەکی جوان لەسەر وتەکەی ئیمام بوخاری لەسەر ئەوەی کە گوتویەتی گوتنەوەی ئێمە بۆ قورئان دروستکراوە و شێخ بەشێوەیەکی ناوازە باسێکی پوختی لەسەر وتە و ڕووداوەکانی کە سەریان هەڵدا لەگەڵ ئیمام و وتەکەیدا داوە .

2_ یەکێکی تر لەگرنگترین ڕوونکردنەوەکانیشی بۆ کتێبەکە بریتیە لەئاماژەدان بەهەڵویستی هەر یەکێك لە ئەهلی سوننە و جەماعە و کۆمەڵەکانی تری ئەهلی بیدعە بەرامبەر هەر باس و صیفەتێك لەصیفەتەکان بۆ نموونە ئەگەر هاتوو باسی صیفەتی ڕوو ( الوجە ) کردبێت ئەوا هاتووە مەنهەجی هەریەکێك لە ئەهلی سوننە و جەماعە کە ئەوەیان هەقە و گرووپەکانی تری ئەهلی بیدعە باسکردووە .

3_ ڕوونکەرەوە هاتووە لە باسی هەر صیفەتێك لەصیفەتەکان کە نوسەر ئاماژەی پێداوە صیفەتەکانی تری ئەو صیفەتەی باسکردووە ، بۆ نموونە نوسەر باسی صیفەتی دەستی کردووە ، ڕوونکەرەوە هاتووە باسی صیفەتەکانی تریشی کردووە کە صیفەتی الله تعالی وەك: پەنجەکان و نینۆك و ناولەپ بەو شێوەیە لەهەر صیفەتێك لە صیفەتەکانی تر .

4_ باسی ڕاجیاییەکانی ( خلاف ) کردووە لەهەر باسێك کە ڕاجیایی لەسەر بێت و باسکردنی ڕای دروست و بەڵگەکانی ڕاجیایان چین و ڕای دروستیش کامەیە و هۆکاری چییە و بەڵگەکان چین بۆ ئەوەی کە ئەو ڕایە ڕای دروست بێت .
وە سەبارەت بەشێوازی وەرگێڕانەکەش ئەوا هەوڵمداوە بەپێی توانا چاکترین و گونجاوترین وشە و دەربڕینەکان بۆ وشە و دەربڕینیە عەرەبیەکان بدۆزمەوە ، وە زیاتر

شێوازی وەرگێڕانەکەم لەسەر ئەوە داڕشتووە کە دەربڕینەکان و وشەکان لەسەر ئەو تەفسیراتە کوردیانە و کتێبە وەرگێڕدراوە کوردیەکان بنوسم بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی پوخت و ئاسان تێبگەن و ئەو بیروباوەڕە لەلای هەموو کەسێکی موسڵمانی موەحیددا بەزانینی هەموو لایەنەکانی ئەو باسە جێگیر ببێت و لەسەر ڕێڕەوە پاك و دروستەکەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بڕۆن و لادانیان بۆ نەبێت بۆ سەرفرازبوون لەدونیا کە بریتییە لە تام و چێژ و یەقین زیادبوون و گەیشتن بەوپەڕی ناسینی الله تعالى و بەدەستهێنانی سەرفرازی لە قیامەتدا و وەستان بەرامبەر الله بە بیروباوەڕێکی ڕاست و دروست و تەنها الله پەرستی لەهەر سێ جۆرەکەی تەوحید دا .
لەکۆتاییدا دەڵێم: ئەوەی پێکاومە و دروستە لەلایەن الله ـەوەیە ، ئەوەشی نەم پێکاوە و کەموکوڕی تێدا هەیە لەلایەن خۆمەوەیە ، داواکارم لە الله ئەو کارەم بە ئیخلاصەوە بۆ الله تعالى کردبێت ، وە لێمی قبوڵ بکات و سوود بەخوشك و برایانی موسڵمان بگات .

وەرگێڕ: سيف الله السني

## بسم الله الرحمن الرحيم

## ( پێشەکی )

**الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على اشرف الأنبياء والمرسلين نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين وبعد :**

الله تعالى ئاسانی کرد بۆمان بەڕوونکردنەوەی پەرتووکی ڕووناکی بیروباوەڕ ( لمعة الاعتقاد ) هی ئیمام موفق الدين باوکی محمد عبدالله کوڕی احمد کوڕی قدامه ڕەحمەتی الله ی لەسەر بێت ( 541_620 ) .

وە ویستم لەو یارمەتیدانە بەپێی توانا بۆ شەرح کردنی ڕوناکیەکە ( لمعة ) وە باسکردنی هەندێك ڕووداوی سەردەمیانە ، وە گرێدانی بەیەکەوە ، وە ناوم ناوە ( الزناد ) لەڕووی ئەوەی کە یارمەتیدەرە و دیاریکراوە بۆ تێگەشتن و نزیکبونەوە ، وە لەواتاکانی ( الزند ) بریتییە لە: یارمەتیدان هاوکاریکردن ( المساعدة والإعانة ) ، إبن منظور ڕەحمەتی الله ی لەسەر بێت لە ( لسان العرب:3/196 ) فەرموویەتی: ( بەو کەسە دەڵێیت کەوا ڕزگارت دەکات و یارمەتیت ئەدات: ورت بك زنادي ) .

دواکارین لە الله ڕێنیشاندەر و یارمەتی دەرمان بێت .

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين .

نوسینی: علي بن خضير الخضير .

القصيم _ بريدة

## پوختەیەك دەربارەی نوسەری ( لمعة الاعتقاد )

ناوی: عبدالله ی کوڕی أحمده لەنەوەکانی عومەری کوڕی خطابە ( الله لێی ڕازی بێت )، قوڕەیشیە و عەدەویە ، پێش تەواوبوونی نیوەی سەدەی شەشەم لەدایکبووە نزیکەی ساڵی ( 541 ی هیجری )، وە لەساڵی ( 620 ی هیجری ) وەفاتی کردووە ، لەفەلەستین لەدایك بووە وە لەدیمەشق ژیاوە لەشام .

**سەردەمی نوسەر :**

سەردەمی ئەو کە نیوەی دووەمی سەدەی شەشەمە جیادەکرێتەوە بەچەند تایبەتمەندیەك :

1_ سەرهەڵدانی بیروباوەڕی ئەشعەرییەکان لەو سەردەمە و بڵاوبوونەوەی لەنێو خەلکیدا ، بەڵکو تەنانەت دەوڵەت مەنهەجی ڕەسمی لەبیروباوەڕەکانی ئەشعەری بووە کە ئەویش دەولەتی ئەیوبی بوو بەتایبەت صلاح الدینی ئەیوبی لەگەڵ ئەوەشدا کە دەوڵەتێکی موجاهید بوو .

2_ زاڵبوونی خاچپەرستەکان و دەسەڵات گرتنیان بەسەر فەلەستین وە کاتێك خاچپەرستان دەستیان بەسەر فەلەستین داگرتووە ئیمام تەمەنی تەنها ( 8 ) ساڵان بووە ، کە ئەوەش هۆکاربووە بۆ هیجرەت کردنی خانەوادەکەی بۆ دیمەشق .

3_ هەبوونی ڕافضە ( شیعە ) لەسەردەمی ئیمام دا کە لەوکاتیشدا دەوڵەتی خۆیان هەبوو کەئەویش دەوڵەتی ڕافضەی عوبەیدیە مولحیدەکان بوو نەفرەتی الله یان لێبێت ، کە لەمیسر بوون ، ئەوانەی صلاح الدینی ئەیوبی لەناوی بردن .

وە ئیمام لەو سەردەمەدا بەشداری کردووە بەجیهادی زانستی و فێرکردنی بیروباوەڕ ، کاتێك کە کتێبێکی دانا بۆ ڕوونکردنەوەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە و ڕەتدانەوەی بیروباوەڕی ئەشعەرییەکان کە لەسەردەمی خۆیدا بڵاوبوبویەوە .

**نوسراوەکانی ( دانراوەکانی ) :**

لەوانە کتێبی ( لمعة الاعتقاد ) لە ڕوون کردنەوەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە لەناو و صیفەتەکانی الله ( الأسماء والصفات ) دا ، وە قەدەر و ڕۆژی دوایی و ئەوەیشی کە پەیوەستە پێیانەوە ، وە ئەوەشی کە واجبە بەرامبەر هاوەڵان ( الله تعالی لێیان ڕازی بێت ) و هەڵوێست بەرامبەر ئەهلی بیدعە .

وە ڕیسالەیەکی داناوە سەبارەت بەبابەتی بەرزییەتی الله ( العلو ) لەدوو بەشدا ، وە بابەتی بەرزییەتی الله ( العلو ) دادەنرێت بەمەترسیدارترین بابەت کە کاریگەری هەبووە لەسەردەمی ئیمامدا ، بەوەی کە ئەشعەرییەکان صیفەتی بەرزییەتی الله ( العلو ) بۆ الله تعالی جێگیر ( اثبات ) ناکەن .

وە ڕیسالەیەکی داناوە سەبارەت بەحەرامێتی سەیرکردن و خوێندنەوەی کتێبی ئەهلی هەوا و ئارەزوو ، وە ڕیسالەیەك لەزەمکردنی تەئویل کردن ، وە کتێبێکی تر سەبارەت بەقەدەر .

ئەوەی کەوا تێبینی دەکرێت لەو کتێبانەدا ئەوەیە کە هەمووی لە دژی ئەشعەرییەکانە ، بەپلەی یەکەم مەبەستی پێی لەوانە ، بەهەمان شێوە مەبەستی پێی لەموعتەزیلەکان و خەواریجەکان و جەهمییەکانیشە .

وە إبن عماد ئاماژەی بەو کتێب و ڕەسائیلانە داوە لەکتێبەکەیدا بەناوی ( شذرات الذهب ) لە بەرگی پێنجەم لاپەڕە ( 88 ) دا .

ئەوەش نەریت و عاداتی زانایانی خواناسە لەبەرەنگاربوونەوەی ئەو بیروباوەڕی خراپ و مونحەریفانەی ( لادەرانەی ) کەوا بوونیان هەیە لەسەردەمەکانیاندا ، وە دانانی کتێب و ریسالە لەبارەیان .

بێگومان ئیمامیش بەهەمان شێوە بەشداری کردووە لەجیهادی چەکداری بۆ بەرزکردنەوەی وشەی لا إلە إلا الله ئەوەی لەمرۆدا بەبوهتانێکی گەورەوە ناونراوە بەزێدەڕەوی و ئوصولی ، کاتێك کە جیهادی کرد دژی خاچپەرستان و دەرکردنیان لە

فەڵەستین ، وە ئەندامێکی کارا بوو لەسوپای صلاح الدين الأيوبي کە وەستایەوە دژی خاچپەرستەکان تاوەك دەریانی کرد لەقودس ، وە وەك چۆن کوشتاری عوبەیدیەکانی کرد تاوەك کۆتایی پێ هێنان .

**وە بەهەمان شێوە کتێب و نوسراوی هەیە لەلایەنی زانستی فیقهـەوە :**
لەوانەش ( المغني ، والکافي ، وەك چۆن لەزانستی ئصولیشدا هەیەتی وەك: روضة الناظر )

**بابەتی دووەم: هۆکاری دانانی ئەو کتێبە :**
وەك لەپێشوشدا ئاماژەمان پێدا کە سەردەمی ئیمام کۆتایی سەدەی شەشەم بوو کە بیروباوەڕی ئەشعەریەت تێیدا بڵاوبویەوە بۆیە ئەو کتێبەی نوسیووە بۆ ڕەتدانەوەیان .

**بابەتی سێیەم: پێشەکی نوسەر :**
نوسەر لەو کتێبەدا پێشەکیەکی داناوە کە پێکهاتووە لەسێ بابەت باسیان دەکەین بەشێوەیەکی پوخت :
1_ کردنەوە و دەست پێکردنی پێشەکیەکە .
2_ ڕێچکەی سەلەف ( پێشینان ) ی ڕوونکردووتەوە لەبارەی فەرموودە و ئایەتەکانی صیفەتەکان .
3_ ئاگاداربوون لە مخالەفەکردنی ڕێچکەی سەلەف ، بەوەی ناوەدەبرێت بەداهێنان لەناو و صیفەتەکان و بیروباوەڕەکاندا .

ئەو پێشەکیە بەو شێوەیە ڕوون دەکەینەوە کە پێکهاتووە :

**نوسەر فەرموویەتی :**

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله المحمود بكل لسان ، المعبود في كل زمان ، الذي لا يخلو من علمه مكان ، ولا يشغله شأن عن شأن ، جل عن الأشباه والأنداد ، وتنزه عن الصاحبة والأولاد ، ونفذ حكمه في جميع العباد ، لا تمثله العقول بالتفكير ، ولا تتوهمه القلوب بالتصوير ، { **لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ** } [(1)] ، له الأسماء الحسنى ، والصفات العلى { **الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى * لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ الثَّرَى * وَإِنْ تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى** } [(2)] أحاط بكل شيء علماً ، وقهر كل خلوق عزة وحكماً ، ووسع كل شيء رحمة وعلما **{ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْما** } [(3)] .

**ڕوونکردنەوە :**

نوسەر ڕەحمەتی الله ی لێبێت پێشەکیەکەی بە البسملة ( بسم الله الرحمن الرحيم ) و سوپاس و ستایش کردنی الله کردۆتەوە و دەست پێکردووە بەباسکردنی هەندێك لە ناو و صیفەتەکانی ، لەسەرەتادا بە البسملة ( بسم الله الرحمن الرحيم ) دەستی پێکردووە و دەستپێکردنی لەسەرەتادا بە ( بسم الله الرحمن الرحيم ) سوننەتی ئقتیدا کردنە بە فاتیحەی پەرتووکی الله ( واتە سورة الفاتحة ) کاتێك کە الله ( لە سوڕەتی الفاتحة ) بە بسم الله الرحمن الرحيم دەستی پێکردووە ، وە ئیقتیدا کردنە بە کتێبی پێغەمبەری الله سلێمان علیه السلام : ( **وَإِنَّهُ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ** ) [(4)] .

---

(1) سورة الشورى: 11 .

(2) سورة طه: 5 _ 6 _ 7 .

(3) سورة طه: 110 .

(4) سورة النمل: 30 .

بەڵگەی سێیەم ئەو فەرموودە صحیحەی هاتووە لە فەرموودەی أبي سفيانەوە [5] ، ئەو فەرموودەیەی کەوا پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) نوسراوێکی نوسی بۆ هرقل بە ( بسم الله الرحمن الرحيم ) دەستی پێکرد ، ئەوە سەبارەت بە البسملة .

بەڵام الحمد لە ( سوپاسکردنی الله ) ، سەرەتا دەستپێکردنی سوننەتە وە لەڕێبازی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئەوەبوو کە کاتێك وتاری دەستپێدەکرد سوپاسی الله تعالى ی دەکرد و ستایشی دەکرد وەك لەصحیحی موسلیمدا هاتووە ، وەك جابر گێڕاویەتییەوە [6] ، بەڵام سەبارەت بە فەرموودەی: ( هەموو کارێك بە سوپاسی الله دەست پێنەکات بڕاوەیە ) وە لەڕیوایەتێکی تردا ( أبتر ) ئەو فەرموودەیە لاوازە چونکە بەشێوەی مورسەلە لە فەرموودەی زوهریەوە ، وە أبو داود ئاماژەی بەلاوازی داوە لەسونەنەکەیدا لەکتێبی ( الآداب ) لەسەرەتاکەیدا ، ئەوەش سەبارەت بە الحمد لە ( واتە سوپاسکردنی الله ) .

**پاشان نوسەر باسی ستایشی الله ی کردووە بەباسکردنی هەندێك لە ناوەکانی و صیفەتەکانی ئەویشیان بەدوو ڕێگا :**

1_ ستایش کردنی الله بەباسکردنی صیفەتە جێگیربووەکان و ناوە جێگیربووەکانی ، باسی صیفەتی: زانست ( العلم ) ، القهر ( زاڵ – باڵادەست ) ، الرحمة ( بەزەیی ) ، الحكم ( دادوەر ) کرد .

2_ ستایش کردنی الله بەباسکردنی صیفەتە نەفییەکان کە دڵنیاکەرەوەن بۆ صیفەتە تەواوەکانی الله ( الكمال ) ، وە لابردنی هاوشێوە و هاوبەش و هاوەڵ لەسەر الله نەفی کردنی لەوەی کەسی لێ بوبێت وە نەفی کردنی نموونە بۆ هێنانەوەی یاخود نەفی کردنی ئەوەی خەڵکی چۆنیەتی صیفەتەکانی بزانن ، ئەوەیان کە پەیوەستە بەچۆنیەتی دەستپێکردنی پێشەکیەکە .

(5) أخرجه البخاری 7/1 (ح7) ، ومسلم 1393/3 (ح1773) .

(6) ذكره مسلم في كتاب الجمعة ، باب تخفيف الصلاة والخطبة برقم (1973) .

ئەوەی تێبینی دەکرێت لەو دەست پێکردنی پێشەکییە ئەوەیە کەچەند جۆرێکی دەستپێکردنی پێشەکی شەرعی لەخۆ دەگرێت کە **ئەویشیان سێ جۆرە** :

أ__ البسملة ( بسم الله الرحمن الرحيم ) .

ب__ الحمد له ( سوپاس کردنی الله ) .

ج__ ستایش کردنی الله .

وە جۆرێکی تر ماوە کە نوسەر باسی نەکردووە ، ئەویش جۆری باسکردنی ئایەتەکانی دەستپێکردنی پێشەکین کە سێ ئایەتەکەی تەقوان ، کە ناودەبرێت بەخوتبەی پێویستی ( وتاری پێویستی ) ، ئەوەیشی دیارە کە دەستپێکردنەکەی نوسەر هیچ ڕێگرییەکی نییە لەنێوان کۆکردنەوەی دەستپێکردنی پێشەکی یاخود باس کردنی زیاتری .

## نوسەر فەرموویەتی :

( وەسفکراوە بەوەی خۆی وەسفی خۆی پێکردووە لە قورئانەکەیدا ، وە لەسەر زوبانی پێغەمبەرە بەڕێزەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) ، وە هەموو ئەو شتانەی هاتوون لە قورئاندا یاخود بە دروستی هاتوون لەلایەن پێغەمبەرەکەیەوە ( سەلامی الله ی لێ بێت ) لەصیفەتەکانی ڕەحمان ، واجبە ئیمان هێنان پێی ، وە وەرگرتنی بەتەسلیم بوون و ڕەزامەندبوون پێیەوە ، وە وازهێنان لەبەگژداچوونەوەی بەڕەت کردنەوەی و تەئویل کردنی ، وە بەوێکچواندن و نموونە بۆ هێنانەوەی ) .

## ڕوونکردنەوە :

**بابەتی دووەم لە بابەتەکانی پێشەکیەکە :**

بریتییە لە ڕوونکردنەوەی ڕێچکەی سەلەف و سەدە پیرۆزەکان لەبارەی ئایەت و فەرموودەکانی صیفەتەکان کەوا دەست پێدەکات لەو وتەیەی نوسەر : ( وەسفکراوە بەوەی خۆی وەسفی خۆی پێکردووە لە قورئانەکەیدا تاوەکو کۆتایی وتەکەی ئیمامی شافعی ) .

**پوختەی ئەو وتانەی نوسەر :**

1ــ ڕێچکەی سەلەف لەبارەی صیفەتەکانی الله کە وەسفی الله دەکەن بەو شێوەیەی کە وەسفی خۆی پێکردووە جا ئەگەر صیفەتەکە لەقورئان هاتبێت یاخود بە دروستی لە سوننەت هاتبێت .

2ــ لەڕێچکەی سەلەف ئەوەیە کە ئیمان دەهێنن بەو صیفەتانە وە نوسەر حوکمی ئیمان هێنانی بەو صیفەتانە باسکردووە کە واجبە وەك فەرموویەتی: ( **واجبە ئیمان هێنان پێی** ) .

3ــ وەرگرتنی بە تەسلیم بوون و ڕەزامەندبوون پێی ، وە تەسلیم بوون: بریتییە لەملکەچ بوون کە دژی وازهێنانە ، وە ڕەزامەندبوون پێی: دژی ڕەتکردنەوەیە .

4ــ وازهێنان لە بەگژداچوونەوەی ئایەت و فەرموودەکانی صیفات ، واتە: وازهێنان لە ڕەخنەگرتن .

**وە وازهێنان بۆ پێنج شتە ( نوسەر ئاماژەی پێداوە ) :**

أــ ڕەت کردنەوە: مەبەست لێی ئینکاریکردن و بەدرۆخستنەوەیە .

بــ تەفسیرکردنی باطل ( التأویل ) : مەبەست لێی لابردنییەتی لەڕووکەشی و لەواتا زمانەوانییەکەیدا .

جــ وێکچواندن ( التشبیە ) : مەبەست لێی ئەوەیە کە بگوترێت صیفەتەکانی الله بەو شتە دەچێت ، لەو شتانەی ناسراوە لای خەڵکیدا .

دــ وازهێنان لەنموونە هێنانەوە بۆ صیفەتەکان: مەبەست لێی ئەوەیە کە نەگوترێت صیفەتەکانی الله وەك ئەو شتەیە **وە جیاوازی نێوان وێکچواندن ( التشبیە ) و نموونە بۆهێنانەوە ( التمثیل ) :**

( التشبیە ) : بریتییە لەوێکچواندنی صیفەتەکان بەشتێکی تر ، واتە: لێکچوون هەیە لەهەندێك ڕووەوە لەنێوان صیفەتەکانی الله و دروستکراوەکان .

بەڵام ( التمثیل ) : بریتیە لەوەی بگوترێت صیفەتەکانی الله ڕێك وەك ئەو شتەیە ، وە هاوشێیوە بریتییە لەوەی هاوشێوەی ئەو بێت لەهەموو شتێك .

بەڵام ( التشبيه ) وێکچواندنییەتی لەهەندێ ڕووەوە .
هـ_ بەگژدانەچوونەوە لەچۆنیەتی صیفەتەکانی الله .

**ئەمە ڕێچکەی سەلەفە بۆ صیفەتەکانی الله** ئەو ڕێچکەیەش کۆدەنگی لەسەرە لەلای سەلەف ، بەکاردەهێنرێت لەهەموو صیفەتێك لەصیفەتەکانی الله ، وە هەر چوار بنەماکەی پێشوو جێبەجێ دەکرێت لەسەری کە لەپێش ئەو دابەش کردنە باسکران .
وە ئەو بەڵگانەی باسکردووە کە پشتگیری ڕێچکەی سەلەف دەکات و ئەو کردنە بەڵگەیەی **پێك هاتووە لەسێ شت :**
1_ یان ئایەتێکە .
2_ یاخود وتەی ئیمامێك لە زانایانی سەلەف کە ئەویش ئیمامی أحمدە .
3_ یاخود وتەی ئیمامێك لە زانایانی سەلەف کە ئیمامی شافعی ـە .

ئەو ئایەتە دەهێنینەوە ( **وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ** ) :
ئەوەی لەو ئایەتە وەردەگیرێت ( **يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِ** ) ، ئەو قسەیەیان: کەدەڵێن بڕوامان پێ هێنا تەسلیم بوون و ڕەزامەندبوون پێی دەگرێتەوە ، وە لەداواکارییەکانی ئیمان وەسفی کردنی الله یە بەو شێوەیەی خۆی وەسفی خۆی پێ کردووە ، وە بەڵگەیە بۆ **پابەند بوون بەوازهێنان لەپێنج شت لە صیفەتەکاندا** ئەوانیش :
ڕەتکردنەوە _ تەئویل کردن _ وێکچواندن _ نمونە بۆ هێنانەوە — شێوە بۆ دانان .
بۆیە ئەو ئایەتە ڕێچکەی سەلەف دەگرێتەوە: لەپێکهاتن و داواکاری و پابەندبوون .
وە پێش ئەوەی بچینە سەر بەڵگەی دووەم پێویستە هەندێ قسە لەسەر ئەو وتانە بکەین کەنوسەر فەرموویەتی :

**نوسەر فەرموویەتی :**
( لەوانەش کە ئیشکالیەت و ناڕوونی لەسەرە لەو شتانە ، واجبە جێگیرکردنی وتەکەی ( لەفزەکەی ) ، وە وازهێنان لەبەگژداچوونەوەی واتاکەی ، وە زانستەکەی بۆ

لای خاوەن وتەکە دەگەڕێنینەوە ، وە بەرپرسیارێتییەکەی دەگێڕینەوە بۆ ئەوەی گواستویەتیەوە ، وەك شوێنکەوتنێك بۆ ڕۆچووان لەزانستدا ، ئەوانەی کە الله ستایشی کردون لەکتابە ڕوونەکەیدا ( کە قورئانی پیرۆزە ) بەو وتەیەی الله تعالی: ( **وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا** ) (7) ، وە دەربارەی زەم کردن و بەخراپ باسکردنی ئەوانەی تەئویلی ئەو ئایەتانە دەکەن کە واتای جۆراوجۆر فراوانیان هەیە ، فەرموویەتی: ( **فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ** ) (8) ، بۆیە ویستنی تەئویل کردنی کردووە بە نیشانەیەك لەسەر لادان ، وە لەو زەم کردنەیان دا ویستنی تەئویلی کردووەتە بەرامبەر بەویستنی فیتنە لەزەمکردن ، دواتر ئەوەی ئاواتیان بوو شاردیەوە بۆ لای خۆی ، وە ئەو مەبەستەی بڕیەوە لێیان لەوەی مەبەستیان بوو ، بە وتەکەی: ( **وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ** ) .

## ڕوونکردنەوە :

### ئاگاداری یەکەم :

وتەکەی نوسەر ( لەوانەش کەئیشکالیەت و ناڕوونی لەسەرە لەوشتانە ، واجبە جێگیرکردنی وتەکەی ( لەفزەکەی ) ، وە وازهێنان لەبەگژداچوونەوەی واتاکەی ) ، محمدی کوڕی ئیبراهیم ڕەخنەی لەو وتەیەی ئیمام گرتووە بەتایبەتی لە وتەی (جێگیرکردنی وتەکەی ( لەفزەکەی ) ، وە وازهێنان لەبەگژداچوونەوەی واتاکەی) .

محمد کوڕی ئیبراهیم فەرموویەتی: لەو وتەیە تفویضی لێ دێتە تێگەیشتن لە صیفەتەکاندا ، کە بریتییە لەوەی وتەکان ( لەفزەکان ) جێگیر بکرێت و واتاکەی نەزانرێت و بەگژدانەچوونەوەیە بۆ واتاکەی .

وە محمدی کوڕی ئیبراهیم فەرموویەتی: **باشتر وایە وازبهێندرێت لەو وتە گوماناویە** ، لەگەڵ ئەوەشدا باسکراوە کە نوسەر بیروباوەڕی سەلەفیە و مفوضە نییە .

(7) سورة آل عمران:7 .

(8) سورة آل عمران:7 .

وتەکەی محمدی کوڕی ئیبراهیم دروستە ئەگەر تەنها ئەو بڕگەی وتەکە وەربگیرێت و واز لەو وتانە بهێندرێت کە لەدوای ئەو وتەیەوە هاتوون ، بەڵام ئەوەی پێش و پاشی ئەو وتەیە بخوێنێتەوە ئەوا تێدەگات کە نوسەر مەبەستی لەوەیە کە وازبهێندرێت لەبەگژداچوونەوە لەچۆنیەتی صیفەتەکان ، هەر بۆیە فەرموویەتی: ( لەوانەش کە ئیشکالیەت و ناڕوونی لەسەرە لەو صیفەتانە ) .

**وە مەبەست لە ئیشکالیەت** تێکەڵی لەو وتەیەدا: چۆنیەتی صیفەتەکەیە ، بەڵام چۆنیەتی صیفەتەکە ئەوەیە کە بەگژ واتا چۆنیەتییەکەی دا ناچێت ، وە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی وتەکەی نوسەر پێویستە ئەو ئایەتە تەفسیر بکرێت کە نوسەر هێناویەتیەوە بریتییە لە ئایەتی ( **وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ** )[9] .

**ڕوونکردنەوەی وتەی: ئیشکالیەت و ناڕوونی لەو صیفەتانە :**

نوسەر پشتی بەو ئایەتە بەستووە : ( **وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ......**) وە تەفسیرکردنی واتاکەی ڕوون دەکاتەوە ، وە نوسەر مەبەستی لەئیشکالیەت و ناڕوونی لەو ئایەتانەیە کە واتای جۆراوجۆر و واتای فراوان ئەدەن .

وە مەبەست لە ( متشابه ) واتای فراوان و جۆراوجۆر لەو ئایەتەدا: بریتیە لەو زانستەی کە الله لای خۆی هێشتویەتیەوە و تەنها خۆی دەیزانێت ، لەوانەش چۆنیەتی لەصیفەتەکانی الله دا بۆیە زانینی چۆنیەتی لەصیفەتەکانی الله دا بریتیە لە ( متشابه ) واتای فراوان ئەدەن .

**وە لەو بەڵگانەش کە مەبەست لە ( متشابه ) ئەوەیە کە تەنها الله دەیزانێت و لای خۆی هێشتویەتیەوە :**

1_ خوێندنەوەکەی إبن مسعود ئەوە ڕووندەکاتەوە ، إبن ابي داود باسی کردووە لە کتێبەکەیدا ( المصاحف: لاپەڕە/ 67 ) لەسەنەدەکەیدا بۆ لای أعمش فەرموویەتی: باوکی

(9) سورة آل عمران: 7 .

عبدالله محمد كوڕى يحيـى بۆ باسكردين ، خلاد كوڕى يزيد بۆى باسكردين لە حسينى جعفيـەوە فـەرمووويـەتـى: گـوێم لـە زائـدە بـوو پسيارى لـە ئـەعمـەش دەكـرد ، ئـەعمـەش فـەرمووى : لـەخوێندنـەوەى ئێمـەدا بـەو شێوەيـە و بـەو شێوەيـەيـە ، دواتـر ئايـەتـەكانى سـورەتـى بـەقـەرەى باسـكرد كـە چـۆن إبـن مسـعود ( الله تعـالى لێـى ڕازى بێـت ) دەيخوێنـدەوە ، دواتـر هـەنديـك ئايـەتـى لـەسورەتـى آل عمران باسكرد كە چۆن إبـن مـەسـعود ( الله تعـالى لێـى ڕازى بێـت ) دەيخوێنـدەوە ، فـەرمـووى: وە لـەخوێندنـەوەى عبدالله ى كـوڕى مسـعود ( الله تعـالى لێى ڕازى بێت ) ئـەوەيـە كە ڕاسـتى و هـەقيقـەتـى تەفسير ( تأويل ) ـەكەى تەنها لاى الله تعالى يـە .

وە خاوەنى كتێبـى ( القراءات وأثرها في التفسير ) كەوا محمد بازمۆلە لە حاشيەتەكەيـدا ( پەراوێزەكەيدا ) فەرمووويەتى: سەنەدەكەى حسنە .

ئـەو خوێندنـەوەيەى إبن مسعوديش ( الله تعالى لێى ڕازى بێت ) واتاى ( متشابه ) ڕوون دەكاتەوە كەمەبەست لێى هەقيقەتى تەئويل كردنە وە هەقيقەتى ئەو جۆرە تەئويلەى متشابهەى كە كەس نايزانێت جگە لە الله نەبێت ، وەكو هەقيقەتى چۆنيەتى قيامەت و هەڵسانى قيامەت ، وە لەوانەش هەقيقەت و چۆنيەتى صيفەتەكان .

2_ واتاى تەئويل لـەقورئانـدا مـەبـەستى لـە هـەقيقـەتى شتـەكـەيـە بـۆيـە وتـەى: ( **وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ** ) واتاى: هەقيقەتى صيفەتەكەيە ، وە لـەفزى تـەئويل لە قورئاندا مەبـەستى لەهەقيقەتى شتەكەيە ، شنقيطي فەرمووويەتى: (هەقيقـەت بريتييە لە ئحتيمالى زۆرينە لە قـورئاندا ) ، وەك فـەرمايشتـى: ( **هَٰذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِن قَبْلُ** ) [10] ، وە فـەرمايشتـى: ( **هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُ** ) [11] واتە: هەقيقەتەكەى ، وە فەرمايشتى ( **هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُ** ) ، وە فـەرمايشتـى ( **وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ** ) [12] ، وە چـاكترين تـەفسير بريتييـە لـەتـەفسيركردنى قورئان بە قورئان ، بەو شێوەيە واتاى: ( **وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَه** ) واتە: هەقيقەتەكەى .

(10) سورة يوسف: 100 .

(11) سورة الاعراف: 53 .

(12) سورة يونس: 39 .

3_ جمهوری سەلەف بڕیاری وەستانیان داوە لە لەفزی ( **إلا الله** ) دواتر ( **والراسخون في العلم...**) تەواو دەکەن ، جا ئەگەر وەستان لەسەر ئەوە بێت ئەوا دەبێتە ئەو تەئویلەی کە جگە لە الله کەس نایزانێت ، بەڵام ڕۆچووان لە زانستدا بڕوا دەهێنن بە متاشبە ، وە شنقيطي فەرموویەتی: ( کە ئەوە مەزهەبی جمهوری سەلەفە ) [13] ، وە إبن جرير لەتەفسیری ئەو ئایەتەدا فەرموویەتی کە ئەوە وتەی ئیمامی مالیکە .

4_ إبن قدامة قسەی کردووە لەسەر ئەو ئایەتە لە کتێبی ( روضة الناظر ) دا و فەرموویەتی مەبەست لەو متشابهەی لە ئایەتەی ال عمران دا ئەوەیە کە الله ئەو زانستەی لای خۆی هێشتۆهتەوە تەنها خۆی دەیزانێت ، وە وەستانی لەسەر وتەی ( **إلا الله** ) کردووە ، وە فەرموویەتی چونکە الله زەم و غەیبەتی ئەوانەی کردووە کە ویستی تەئویل و لادانیان هەیە جا ئەگەر ئەو زەمکردن و غەیبەتکردنە بۆ ڕۆچووانی زانست بووایە ئەوا سوپاس دەکران نەوەك زەم و غەیبەتیان بکرێت ، چونکە ووتەی الله ( **آمنا به** ) بەڵگەیە لەجۆرێك لەجۆرەکانی تفويض ( جێگیر کردنی لەفزەکەی و وازهێنان لە زانینی هەقیقەتی واتای لەفزەکە ) و تەسلیم بوونە بۆ شتێك کە واتاکەیان نەزانیووە ، بۆیە وتەکانی ئیمام هەندێکی ئەوەی تر تەفسیر دەکات وە وتەکانی هەندێکی بە هەندێکی لێك ئەدرێتەوە .

5_ هەڵبژاردنی پێشەوایانی تەفسیرکاران إبن جرير بۆ وەستان لە فەرمایشتی ( **إلا الله** ) وە جۆری متشابە لەو ئایەتە ئەوەیە کە الله لای خۆی هێشتوەتیەوە لەو زانستەی کە هیچ کەسێك ناتوانێت بیزانێت .
لەوەشیان کە بەڵگەی پێنجەمە ڕوون دەبێتەوە کە وتەی نوسەر ( لەوانەش کەئیشکالیەت و نارِوونی لەسەرە لەو صیفەتانە ) مەبەست پێی لە چۆنیەتییە ، چۆنیەتی صیفەتەکانی الله .

(13) لە أضواء البيان لەتەفسیری سورەتی آل عمران لاپەڕە 211 هێناویەتیەوە .

وە وتەی ( واجبە جێگیرکردنی وتەکەی ( لەفزەکەی ) ) : مەبەست لەوەیە کە سەلەف فەرموویانە بەڕێی بکەن وەك چۆن هاتووە .
وە وتەی ( وازهێنان لەبەگژداچوونەوەی واتاکەی ) واتە : وازهێنان لەبەگژداچوونەوەی هەقیقەتی صیفەتەکە لەڕوویە چۆنیەتیەکەیدا ، بەو شێوەیە نوسەر شێوازێکی بەکارهێناوە کە بڵاوبووە لایان ، ئەویش ئەوەیە کە کاتێك ئەگەر بیان ویستایە بەگژ چۆنیەتی صیفەتەکەدا نەچن ، ئەوا دەیان گوت: نابێت بەگژ واتاکەی دا بچینەوە ، مەبەستیان لەوەیە کەبەگژ چۆنیەتییەکەیدا نەچنەوە یاخود بۆ واتای باطڵ و بێ بنەما .
وەك نمونەی وتەی ئیمامی أحمد کە نوسەر باسی کردووە ، کە فەرموویەتی ( بڕوای پێدەهێنین و بەڕاستی دادەنێین بەبێ چۆنیەتی بۆ دانان و بەبێ واتاکردنی ) وە مەبەستیش لە وتەی ئیمامی أحمد ( بەبێ واتاکردنی ) : واتە: واتای باطڵ و بێ بنەمایە کە بریتیە لە تەئویل لەزاراوەی پاشینەکاندا ( زانا پاشینەکان ) ، کەبریتیە لەلادانی وتەکەی ( لەفزەکەی ) لەواتایەکی دروستەوە بۆ واتایەکی نادروست ، ئەوەشی بەڵگەیە لەسەر ئەوە ، ئەوەیە کە الذهبي لەکتێبی ( سير أعلام النبلاء ) نەقڵی کردووە کە کاتێك باسی تەرجەمەی خطيبي بەغدادي دەکات باسی بیروباوەڕی خطيبي بەغدادی دەکات کە بیروباوەڕی موافقی بیروباوەڕی سەلەفە ، هەتاوەکو فەرموویەتی : ( وەك چۆن هاتووە بەبێ شێوە بۆدانان و وێکچواندن و پەکخستن ..... هەتاوەکو فەرمووی: جا ئەگەر گوتمان: الله دەست و چاو و گوێگرتنی هەیە ئەوانە ئەو صیفەتانەن کە الله بۆ خۆی جێگیری کردووە ، ناڵێین واتای دەست بەواتای هەبوونی توانا ( القدرة ) و چاو و گوێ بەواتای زانست دێت .

ئەوەی کەوا لەو وتەیەدا وەردەگیرێت ئەوەیە ناڵێین واتای ( دەست ) واتا هەبوونی توانا ( القدرة ) ، ناونانی صیفەتی دەستی بە توانای کردە واتا ، بەوەش لە زاراوەیان تێدەگەین کاتێك کە نەفی واتای صیفەتەکانی الله دەکەن ئەوا **مەبەستیان لەدوو شتە** :
1__ نەفی کردنی چۆنیەتی واتە چۆنیەتی نییە لەصیفەتەکانی الله دا ( شێوە بۆ دانەنان ) .
2__ نەفی کردنی واتای باطڵ و بێ بنەما کە بریتییە لە ( التأويل ) .

وە ئەوەیشی بڵێت کە دەست بە واتای توانا دێت ئەوا واتایەکی بۆ داناوە ، ئەوە سەبارەت بەوتەی بەبێ واتاکردن ، بەڵام ئەگەر گوتی : ( بەبێ چۆنیەتی وە بەبێ واتاکردنی ) جەمعی نێوان واتا و چۆنیەتی کرد وەکو ئەوە ئیمامی أحمد ئەنجامیدا ئەوا واتا و مەبەست پێی لە تەئویل کردنی باطڵ و بێ بنەمایە .

بەو شێوەیە نوسەرمان سەرخست ووتەکەی دروست و سەلیمە بەپێی زاراوەی خۆیان وە ئەو زاراوەیەوە بوونی هەیە لە وتەی سەلەفدا کە نەفی کردنی واتاکەیەتی بەڵکو لەوتەی سەلەفدا هەیە کە نەفی تەفسیر دەکەن ، وەك دەڵێن تەفسیری ناکەین ، هەروەکو الذهبي نەقڵی کردووە لە کتێبی ( سير أعلام النبلاء ) لە باوکی عبيد السلام کوڕی قاسم کە باوکی عبيد فەرموویەتی: عبدالعزيز الماجشون فەرموویەتی لە ڕیسالەکەیدا ( الرد على الجهمية ) وە ئیبنو تەیمیە نەقڵی کردووە لە کتێبی ( الحموية ) لە پێشەکیەکەدا دوای ئەوەی سوپاس و ستایشی الله ی کرد فەرمووی: زوبان کەوتووە لەتەفسیر کردنی صیفەتەکانی ، واتای نەفی کردنی تەفسیر لەوتەی سەلەفدا واتە نەفی کردنی چۆنیەتی صیفەتەکە یاخود تەئویل کردنێکی باطڵ و بێ بنەما ، وەکو وتەی نەفیکردنی واتاکەی .

وە نمونەیەکی تر هاوشێوەی ئەوە هەڵوێستێك بوو کە سەلەف لەسەری ڕۆشتوون لە ئایەتەکانی صیفەتەکان کە دەڵێن بەڕێی بکەن وەك چۆن هاتووە ، واتە: چۆنیەتی بۆ صیفەتەکان بڕیار مەدەن ، وە باسی واتای باطڵ و بێ بنەما مەکەن ، بەڵام ئەگەر ئەم دەستەواژانە بەو شێوەیە هات لەوتەی سەلەفدا واچاکترە تەفسیری واتاکەیان بکەین و ڕوونیان بکەینەوە ، وەك چۆنە لەبیروباوەڕی سەلەفدا ، نا بۆ ئەوەی ڕەخنەیان لێ بگرین لەسەر ئەو وتانە و بڵێین هەڵەیان هەیە لەکاتێکدا کە شێوازێکە کە یەك دوای یەك لەسەری ڕۆشتوون الله ڕەحم بەهەموویان بکات .

**پرسێك: وتەی نوسەر ( ئیشكالیەت و ناڕوونی ) : ڕاجیای هەیە لە لێكدانەوەی واتای ئەو وتەیەی نوسەر ، وە مەبەستی چییە لە ئیشكالیەت بەسەر سێ بەشدا :**

1_ هەندێكیان ئەو وتەیەی نوسەریان لێكداوەتە بە: واتای فراوان ( مشكل ) بەپێی هەندێك لەصیفەتەكان وە گوتیان هەندێك لەصیفەتەكان هەیە كە ئیشكالیەت و ناڕوونی هەیە وەك صیفەتی: دابەزین و بەرزبونەوە لەسەر عەرش و وێنە ، لەو ڕووەی هەندێك ئیشكالیەت و تێكەڵاوی دێت لەو صیفەتانە ، وەك ئەو وتەیان لەكاتی جێگیركردنی صیفەتی دابەزین ئایا عەرش چۆل دەبێت لەكاتی دابەزینی یاخود نا ؟ ، وە ئەگەر الله بەرزبوەتەوە بۆ سەر عەرش ئایا لەو گەورەترە یاخود یەكسانن ؟ ، وە گوتیان: نوسەر مەبەستی لەوەیە وە گوتیان صیفەتە فراوانەكان ، پێویستە جێگیركردنی وتەكە (لەفزەكە) ی بەبێ بەگژداچوونەوەی واتاكەی .

2_ وە هەندێكیان گوتیان كە ئیشكالیەتە و ناڕوونیە بەپێی كەسەكان و ناڕوونیەكە بۆ كەسایەتی دەگەڕێتەوە بەپێی زانست و نەزانی كەسەكە وە ئەو شتەشی كە ناڕوونە لای هەندێك كەس مەرج نییە لای كەسانی تر نا ڕوون بێت ، وە واجبە ئەوەی ئیشكالیەت و ناڕوونـی بۆ دروست بوو بەهـۆی كەم و كورتی تێگەیشتنـی یان زانستەكەی ، واجبە وتـەكە ( لەفزەكە ) ی جێگیربكات و بەگژ واتاكەیدا نەچێتەوە .

3_ مەبەست لە ئیشكالیەت و ناڕوونی لای نوسەر چۆنیەتی صیفەتەكانە و بەگژ واتای چۆنیەتەكەیدا ناچینەوە ، بەڵكو لەفزەكەی جێگیر دەكەین .

ئـەو ڕایـەی سێیەمیش وتـەی دروستـە چونكـە مـەبـەستـی نوسـەر لـەوەیـە وەك چۆن ئەوەشمان ڕوون كردەوە لـەشـەرحی ئایـەتی: ( **وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ** ) ، بەڵام وتەكانی یەكەم و دووەم ئەوا دروستن بەپێی واتاكەی بەڵام نوسەر مەبەستی لەوە نەبووە .

## بەشێك

## نوسەر فەرموویەتی :

( ئیمام عبدالله أحمدی كوڕی محمد كوڕی حنبل سەبارەت بەو فەرموودانەی پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) : ( **الله تعالى دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا** ) [14] ، یاخود فەرموودەی: ( **الله تعالى دەبینرێت له قیامەتدا** ) [15] ، هاوشێوەی ئەو فەرموودانه ئەوا ئیمانی پێ دەهێنین و بەڕاستی دادەنێین ، بەبێ چۆنیەتی و بەبێ واتاكردنی ، هیچ شتێكیشی لێ ڕەت ناكەینەوە ، وە دەزانین ئەوەی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی هەقە و ڕەدی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) نادەینەوە .

وە وەسفی زیاتری الله ناكەین بەوەی كەوا خۆی وەسفی خۆی پێكردووە بەبێ سنور (حەد) و بەبێ ئەندازە: ( **لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ۖ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ** ) [16] ، وە ئەوە دەڵێین كە فەرموویەتی بەوە وەسفی دەكەین كە وەسفی خۆی پێ كردووە ، لەوە تێناپەڕین ، وە وەسفی وەسفكاران ناگات بە ڕادەی صیفەتەكەی ، ئیمان بەهەموو قورئان دەهێنین بە موحكم و متشابە ، وە هیچ صیفەتێكی نەفی ناكەین بەهۆی ئینكارییەك كەدروستبووە ، لەقورئان و سوننەت تێناپەڕین و نازانین هەقیقەتەكەی چۆنە مەگەر بە ڕاستدانانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) و له قورئاندا جێگیر بوبێت .

وە ئیمامی باوكی عبدالله محمدی كوڕی ادریس شافعی ( ڕەحمەتی الله تعالى ی لێبێت ) فەرموویەتی: ( ئیمانم هێنا به الله وە ئەوەش هاتووە لەلایەن الله یەوە لەسەر مەبەستی الله ، وە ئیمانم هێنا بەپێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) وە ئەوەیشی هاتووە لەلایەن پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) لەسەر مەبەستی پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم )) .

---

(14) رواه مسلم في صحيحه 522/1 (ح658) ، والنسائي في سننه 125/6 ، (ح10318) ، والدارمي في سننه 413/1 (ح1480) .

(15) رواه البخاري بوخارى في صحيحه 203/1 ، (ح529) ، ومسلم في صحيحه 439/1 (ح633) .

(16) سورة الشورى: 11 .

بەو شێوەیە سەلەف و زانایانی دوای ئەوان لەیەك لەدوای یەك لەسەر ئەو شێوازە ڕۆشتوون ، ڕەزای الله یان لەسەر بێت ، هەموویان یەكدەنگن بەدانپیانان بەصیفەتەكان وە بەڕێكردنی وەك چۆن هاتووە ، وە جێگیركردنی ئەو شتانەی لەسەر صیفەتەكانی هاتوون لەكتێبی الله دا و لەسوننەتی پێغەمبەرەكەیدا (صلى الله عليه وسلم) بەبێ بەگژداچونەوەی تەفسیرەكەی ( چۆنیەتیەكەی ) .

## ڕوونكردنەوە :

دوای ئەوە نوسەر باسی بەڵگەیەی دووەمی كردووە لەبەڵگەی ڕێچكەی سەلەف سەبارەت بەصیفەتەكان ، كە ئەویش وتەی ئیمامی احمدە ، كەڕێچكەی سەلەف ڕوون دەكاتەوە وەك ئیمامی أحمد دەربارەی فەرموودەی ( الله لەقیامەتدا دەبینرێت ) دەفەرمووێت: بڕوای پێدەهێنین و بەڕاستی دادەنێین بەبێ چۆنیەتی و واتاكردنی ، **وتەكەی ئیمامی أحمد ئەو شتانە لەخۆ دەگرێت :**

1_ بڕوا هێنان بە صیفەتەكان و بەڕاستدانانی وەك چۆن هاتووە .
2_ وازهێنان لەبەگژداچونەوەی واتای باطڵ و بێ بنەما ، وەك: تشبيه ( وێكچواندن ) یاخود نمونە بۆ هێنانەوە ، یاخود تحريف ( گۆڕینی واتاكەی یان لەفزەكەی ) ، یاخود پەكخستنی ، هەر بۆیە فەرموویەتی: ( بەبێ واتاكردنی ) .
3_ وازهێنان لەئینكاریكردن و بەدرۆخستنەوەی و ڕەتكردنەوەی صیفەتەكان ، هەر بۆیە فەرموویەتی: ڕەدی پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) نادەینەوە .
4_ ناوەندیەتی لەسەر صیفەتەكانی الله كە خۆی خۆی پێ وەسف كردووە بەبێ سنور بەزاندن و زیادكردنی ، هەر بۆیە فەرموویەتی: ( هیچ صیفەتێك لە صیفەتەكانی لەسەر لانابەین و لە سنوری قورئان و سوننەت تێناپەڕین ) .

لێرەدا هەندێ وشەی ئیمامی أحمد هەیە كە گفوگۆیان لەسەر كردووە ، كە ئەوانیش سێ وشەن: لە وتەكانی ( بەبێ واتا كردن ) وە وتەی ( بەبێ سنور ( حەد ) و ئەندازە ) .

هەندێك لە ئەهلی زانست ڕەخنەیان لەو سێ وتەیە گرتووە وەڵامی ئەو ڕەخنانەش هەمان شێوەی ئەوەیە کە لەسەر نوسەر دامانەوە وەك وتەکەی ( بەگژ واتاکەیدا ناچینەوە ) .
بەو شێوەیە مەبەستی ئیمام أحمد بریتیە لە واتای باطڵ و بێ بنەما ، کە ئەوەش شێوازێکە لەشێوازەکانیان و هیچ ناڕوونیەك نییە لە زاراوەکەیاندا ، وە هەڵەیە بە هەڵەدانانی پێشینان بە زاراوەکانی سەردەمییەکان .

وە وتەی ئیمامی أحمد ( بەبێ حەد ( سنور - مەسافە ) ، ئەو وتەیە سەلەف دەریان بڕی لەو شتانەی جەهمیەکان دایان هێنا ، ئەگەرنا پێش ئەوە ئەو وتانەیان دەرنەدەبڕی ، وە دەریان دەبڕی بۆ وەڵامدانەوەیان وە مەبەستیان لە ( حەد ) کاتێك کە جێگیری دەکەن ئەوەیە کە بەتاڵە لە تێکەڵی لەگەڵ دروستکراوەکانی ، وە کاتێك کە نەفی ( جێگیری ) دەکەن مەبەستیان لەوەیە کە هیچ شتێك دەورەی نەداوە وە کۆتاییەکەی نازانرێت ، وە ئەو بابەتی ( حەدە ) ئیمامی الدارمي باسی کردووە لە کتێبی ڕەتدانەوەی بشر المریسي ، وە إبن المبارك یش بەهەمان شێوە ، وە مەبەستیان لێی مەبەستێکی دروست بوو .

__ دواتر بەڵگەیەکی باسکردووە لەسەر ڕێچکەی سەلەف ، کە وتەکەی شافعیە ، وتەکەی باسکردووە کە بریتییە لە: ( ئیمانم هێنا بە الله وە ئەوەش هاتووە لەلایەن الله یەوە لەسەر مەبەستی الله ، وە ئیمانم هێنا بە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) وە ئەوەشی هاتووە لەلایەن پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) لەسەر مەبەستی پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) ) .

**پوختەی وتەکەی شافعی :**

1__ ئیمان هێنان بەصیفەتەکان و بەڕاستدانانیان .
2__ دانپێدانان و جێگیرکردنی صیفەتەکان لەسەر ڕێچکەی قورئان و سوننەت بەبێ تەئویل و بەبێ شێوە بۆدانان و بەبێ تەحریفکردنی .

وە هەڵبژاردنی وتەکەی شافعی لەلایەن نوسەرەوە هەڵبژاردنێکی زۆر تەواو و مەبەستێکی چاکە ، چونکە سەردەمی نوسەر سەردەمی ئەشعەریەکان بوو ، ئەو بیروباوەڕە بووکە بڵاوبووە و خۆیان ئەدایە پاڵ شافعی وەك مەزهەب ، بۆیە هێنانەوەی وتەی ئیمامەکەیان کە لەسەر ڕێچکەی سەلەفە و وەڵامێکی ڕوونە لەوەی کە پاپەند نین بەڕێچکەی ئیمامەکەیان .

پاشان نوسەر قسەی لەسەر هەردوو وتەی ئیمامەکەدا وە فەرمووی: سەلەف و خەلەف یەك بەدوای یەك لەسەر ئەوە ڕۆشتوون کە تێکڕایان کۆدەنگن لەسەر دانپیانان و بەڕێکردنی وەك چۆن هاتووە و جێگیرکردنی ، **باسی کۆدەنگی سەلەفی کردووە لەسەر سێ شت لە صیفەتەکاندا :**

1_ دانپیانان وە مەبەستیش لێی ئیمان هێنان پێی و بەڕاستدانانی و تەسلیم بوون و ملکەچ بوون بۆی .

2_ بەڕێکردنی وەك چۆن هاتووە واتە: وازهێنان لەنموونە بۆ هێنانەوە و شێوە بۆدانان و تحریف و تەئویل .

3_ جێگیرکردن: بریتییە لە وەسفکردنی الله بەو صیفەتە .

**نوسەر فەرموویەتی :**

( فەرمانی پێکردووین بە شوێنکەوتنی ئاثارەکانیان ، وە دەستگرتن بە ڕووناکیەکەیانەوە ، وە ئاگاداری کردوینەتەوە لەداهێنان لەدیندا و هەواڵی پێداوین کە لەگومڕاییە وەك پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی: ( **پەیوەست بن بەسوننەتی من و سوننەتی جێنشینە ڕێپیشاندەر و ڕێنمایکراوەکانی دوای من ، دەستی پێوە بگرن و توند بەکاکیلەکانتان قەپی پێدا بکەن ، وە وریای شتە نوێیەکان بن لەئایندا ، چونکە هەموو نوێگەری و داهێنانێك لەئایندا بیدعەیە ، وە هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە ، وە هەموو گومڕاییەکیش لە ئاگر دایە** ) [17] .

(17) أخرجه أحمد في مسنده 120/4 (ح17125) ، و أبو داود في سننه 200/4 (ح4607) .

وە عبدالله بن مسعود (الله تعالى لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ( شوێنی سوننەت بکەون و بیدعە دامەهێنن کیفایەت دەبێت بۆتان ) .
وە عومەری کوڕی عبدالعزیز فەرموویەتی: ( لەو شوێنە وازبێنە کە ئەو گەلە وازیان هێنا لێی ، ئەوانە لە زۆری زانستەوە وازیان هێنا ، وە بەچاوێکی تەواوەوە وازیان هێنا ، وە کەشف کردنی ئەو شتانە زۆر ئاسان تر بوو لایان ، وە فەزڵیان زیاتر بوو ئەگەر ئەو شتە هەقی تیابوایە ، جا ئەگەر گوتتان: داهێنان بکە لەدوایان ، هیچ کەسێك داهێنان ناکات مەگەر پێچەوانەی ڕێبازیانی کردبێت ، وە پشتی کردبێت لەسوننەتیان ، وە ئەوەندە وەسفیان کردووە کە چارەسەرە ، وە ئەوەندە قسەیان لەسەر کرد کە کیفایەت بوو ، ئەوەی لەسەرووی ئەوانەوەیە زیادەیە ، ئەوەشی لەوان دا نەبێت ئەوا کەمییە ، وە گەلانێك کەمیان کرد تیایدا و بەهیلاك چوون ، وە ئەوانی تر سنوری ئەوانیان بەزاند و زیادەڕەوییان کرد ، ئەوانیش لە نێوانیان دا لەسەر ڕێبازێکی ڕاست و دامەزراووە .
أبو عمر الأوزاعي فەرموویەتی: ( دەست بگرە بە ئاثاری پێشینانت ئەگەر خەڵکیش ڕەتیان کردیەوە ئاگاداربە لە ڕاو و بۆچۆنی پیاوان ئەگەر بە قسەش بۆتیان ڕازاندەوە ) .
وە محمدی کوڕی عبدالرحمن ئەذرەمی بە پیاوێکی گوت کە باسی بیدعەی دەکرد و بانگەشەی خەڵکی بۆ دەکرد: ( ئایا پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) و ئەبوبەکر وە عومەر و عثمان و علي دەیانزانی یاخود نا ؟ گوتی: نەیان دەزانی ، فەرمووی: جا شتێك ئەوانە نەیان زانیبێت تۆ دەیزانی ؟ گوتی: من دەڵێم دەیانزانی ، فەرمووی: ئایا سودی هەبوو بۆیان لەوەی کە باسی نەکەن و بانگەوازی خەڵکی نەکەن بۆی یاخود سودی نەبوو بۆیان ؟ ، گوتی: بەڵێ سودی هەبوو بۆیان ، فەرمووی: جا شتێك سودی هەبووبێت بۆ پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) و جێنشینەکانی ، سودی بۆ تۆ نابێت ؟ جا پیاوەکە بێدەنگ بوو و خەلیفە - کە ئامادە بوو - فەرمووی: الله سود بەو کەسە نەگەیێنێت کە سودی نەبووە بۆی لەو شتانەی کە سودی هەبوو بۆ ئەوان .
بەو شێوەیە ئەو کەسەی ئەو شتە سودی نەبێت بۆی کەسودی بۆ پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی لە چاکەدا هەبووە ، وە زانایانی دوای

ئەوانیش ، وە ڕۆچووان لەزانستدا ، وتنەوەی ئایەتەکانی صیفەتەکان ، وە خوێندنەوەی هەواڵەکەی ، وە بەڕێکردنی وەك چۆن هاتووە ، ئەوا الله سودی پێنەگەیێنێت ) .

**ڕوونکردنەوە :**

**بابەتی سێیەم لەبابەتەکانی پێشەکیەکە :**

بریتییە لە ئاگاداری لەداهێنان لەدیندا و ڕێچکەیەك جگە لەڕێچکەی سەلەف لە لەناو و صیفەتەکانی الله و بیروباوەڕەکاندا :

وە هەندێ بەڵگەی باسکردووە سەبارەت بە ئاگاداری لە داهێنان لەدیندا ، وە لەوانەش داهێنـان لـەصـیفەتـەکـانی الله و وەسـفکردنی بـەشـێوەیـەك کـە خـۆی وەسـفی خـۆی پێنەکردووە ، وە سودی ئەو بابەتە: ئەوەیە کە داهێنان لەدیندا بە جگە لەڕێچکەی سەلەف سەبارەت بە ئایەت و فەرموودەکانی صیفەتەکان ئەوا حەرامە و دەبێتە هۆی لادان ( انحراف ) .

**ئەو دەق و بەڵگانەی کە نوسەر باسی کردووە پێنجن :**

أ__ فەرموودەی: ( پەیوەست بن بەسوننەتی من و سوننەتی جێنشینە ڕێپیشاندەر و ڕێنمایکراوەکانی دوای من ) ئەبو داوود و ترمذي ڕیوایەتیان کردووە .

ب__ وتەکەی إبن مسعود ( الله تعالی لێی ڕازی بێت ) سەبارەت بە ئاگاداری داهێنان کە فەرموویەتی: ( شوێن سوننەت بکەون و بیدعە دامەهێنن کیفایەت دەبێت بۆتان ) .

ج__ وتەکەی عومەری کوڕی عبدالعزیز کە فەرموویەتی: ( لەو شوێنە وازبێنە کەئەو گەلە وازیان هێنا لێی ، ئەوانە لە زۆری زانستەوە وازیان هێنا ) .

هـ__ وتەکەی ئەوزاعي : ( دەست بگرە بە ئاثاری پێشینانت تەنانەت ئەگەر خەڵکیش ڕەتیان کردیەوە ) .

و__ بریتییە لە گفتوگۆی بیدعەچییێك و سوننەیەك کە ئەویش بە مەنهەج دائەنرێت بۆ ڕەتدانـەوەی بیدعـەچیـان ، وە مـەنهـەجێـك بـۆ گفتوگـۆکردن لـەگـەڵ بیدعـەچیـان ، گفتوگۆکەرەکەش عبدالرحمنی ئەذرەمیە کە گفتوگۆی لەگەڵ أحمدی کوڕی باوکی

داوودی جەهمی بووە لەسەردەمی خەلیفە واثقدا ، وە نوسەر لێرەدا پوختی کردۆتەوە ، وە إبـن بطـة لـە ( الإبانـة ) لـەکتێبـی ( الـرد علـی الجهميـة ) کـە کاتێــك باسـی ئـەو گفتوگۆیانـەی کردووە کە کراوە و گوتراوە بە ئامادەبوونی پاشاکاندا .

**پوختـەی ئـەو گفتوگۆیە** واتـە بیدعـەداهێنـەر لـەدیندا پرسیارێکی بـەڕوودا دەکرێت: ئایا ئەوەی دایهێناوە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) دەیزانی یاخود نا ؟ وەڵامەکەش لەدوو شێوە تێناپەڕێت: یان دەڵێت: زانی ، یاخود دەڵێت: نەیدەزانی ، جا ئەگەر گوتی نەیدەزانی ئیمەش دەڵێین: چۆن هیدایـەت دراویت بۆ شتێك کە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) و هاوەڵانـی نـەیان زانیــوە ، ئـەگـەر گوتیشــی: دەیزانـی ، دەڵێین: ئایا پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) ئەنجامی داوە و خەڵکی بانگەشە کردووە بۆی ؟ ئـەگـەر گوتی: بانگەوازی کردنـی بـۆی پێویستـی بـەوەیـە لێیـەوە جێگیربووبێت ، ئـەگـەر گوتیشی: نەخێر ، پێی دەڵێین: شتێك کە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بانگەوازی بۆ نەکردبێت هیچ خێرێکی تیا نییە .
ئەذرەمیش ئەو ڕێچکەیەی گفتوگۆیانەی لە إبن مسعودەوە ( الله تعالی لێی ڕازی بێت ) وەرگرتووە ، کە إبن وضاح لەکتێبی ( البدع ) لەپێشەکی کتێبەکەدا ڕیوایەتی کردووە : کە إبـن مسـعود ( الله تعـالی لێـی ڕازی بێـت ) بـەلای کۆمـەڵـەیـەك تێپـەڕی کـەشێوازێکیان داهێنا بوو لـە تـەسبیح و زیکر کردن ، جا پێیانی فەرمووە : ( ڕێبازێکتـان گرتۆتـەبـەر کە پێغەمبەرەکەتان ئەو ڕێبازەی نەگرتووتەبەر ، یاخود ئێوە دەستتان گرتووە بە گوناهــو پەتی گومڕاییەوە ) .

## بابەتێك

پاشان نوسەر بەشێكی داناوە بەباسكردنی هەندێك لە صیفەتەكانی الله تعالی ، كە ئەوەی باسی كردووە نزیكەی **هەژدە صیفەتە لەصیفەتەكانی الله تعالی دا** ، ئەویش بەو شێوەیە :

1_ صیفەتی ڕوو ( الوجه ) بۆ الله تعالی .

2_ صیفەتی هەردوو دەست بۆ الله تعالی .

3_ صیفەتی نەفس بۆ الله تعالی .

4_ صیفەتی هاتن ( المجيء ) بۆ الله تعالی .

5_ صیفەتی هاتن ( الأتيان ) بۆ الله تعالی .

6_ صیفەتی ڕازی بوون بۆ الله تعالی .

7_ صیفەتی خۆشەویستی بۆ الله تعالی .

8_ صیفەتی الغضب بۆ الله تعالی ( بریتییە لەو توڕەیەی كە لەگەورەوە بۆ بچوكە و لە بچووكەوە بۆ گەورەیە ) .

9_ صیفەتی السخط بۆ الله تعالی ( بریتیە لەو ڕقلێبوونەوەیەی كە تەنها لەگەورەوە بۆ بچوكەوەیە ) .

10_ صیفەتی ڕق لێبونەوە بۆ الله تعالی .

11_ صیفەتی دابەزین بۆ الله تعالی .

12_ صیفەتی سەرسوڕمان بۆ الله تعالی .

13_ صیفەتی پێكەنین بۆ الله تعالی .

14_ صیفەتی الاستواء بۆ الله تعالی ( بریتییە لەو بەرزبوونەوەیەی كە كرداریە پەیوەستە بە ویستی الله تعالی ) .

15_ صیفەتی العلو ( بەرزییەتی ) بۆ الله تعالی ( بریتییە لەو بەرزبونەوەیەی كە پێویستە بۆ الله تعالی و نابێت نەبێت و صیفەتێكی ذاتییە ) .

16_ صیفەتی قسە كردن بۆ الله تعالی .

17_ صیفەتی بینینی الله تعالی لەلایەن ئیماندارانەوە لە ڕۆژی قیامەتدا .
18_ دوای ئەو صیفەتە کە الله تعالی هەرچی بیەوێت ئەنجامی ئەدات ، لەگەڵیشدا باسی صیفەتەکانی ویستن و ئارەزوو لێبوونی کردووە لەگەڵ یەك .

**ئەوە بەشێوەیەکی فراوان ، بەڵام بەشێوە جیا جیا بەو شێوەیەیە :**
نوسەر ئایەتەکانی صیفەتەکان و کۆمەڵێك لە فەرموودەکانی هێناوەتەوە و باسیانی کردووە ، وە تێکڕای ئەو صیفەتانەی کە باسی کردوون هەژدە صیفەتە هەندێك کات کە باسی کۆمەڵێك لە صیفەتەکان دەکات و دووبارە پێداچوونەوەی کردووە ، لەدواییدا باسی مەنهەجی سەلەف دەکات لە صیفەتەکاندا ، ئەو پێداچوونەوەش هەندێك جار درێژ دەبێتەوە و هەندێك جاریش پوخت دەبێتەوە .

لەسەرەتادا باسی سیانزە صیفەتی کردووە لەدوای ئەوەدا گەڕاوەتەوە سەری دووبارە و باسی بنەمای سەلەفی کردووە لە صیفەتەکاندا ، ئەمەشیان پێداچوونەوەی یەکەمە ، دواتر دووبارە گەڕاوەتەوە بە باس کردنی هەندێك لە صیفەتەکان ، کە باسی دوو صیفاتی گرنگی کردووە کە هەمیشە قسە و گفتوگۆیان لەسەر دروست دەبێت ، کە بریتین لە صیفەتەکانی بەرزییەتی و بەرزبوونەوە ( العلو والاستواء ) دواتر جارێکی تر گەڕاوەتەوە سەر پێداچوونەوە و باسی مەنهەجی سەلەفی کردووە ، لە ئیمامی مالیکەوە باسی ڕێبازی سەلەفی کردووە ، دواتر باسی صیفەتی قسەکردنی بۆ الله کردووە و قسەکانی درێژکردوەتەوە لەسەری دواتر باسی قورئانی کردووە بەهەمان شێوە درێژی کردۆتەوە ، وە باسی صیفەتی ویستن و توانینی کردووە و قسەکانی درێژ کردۆتەوە لەسەری ، وە باسی بینینی ئیماناداراانی بۆ الله کردووە لەرۆژی قیامەتدا و درێژیەی پێداوە ، لەدوای ئەوەدا کۆتایی هێنا بە بەو ئایەت و فەرموودانەی صیفات کە باسکراوە .

**ئەوەی تێبینی دەکرێت لەسەر نوسەر ڕەحمەتی الله ی لەسەر بێت کاتێك کە باسی صیفەتەکان بۆ الله دەکات ئەو چەند تێبینیەن :**

1_ بەکورتی باسی جێگیرکردنی صیفەتەکان دەکات بەوەی سەلەف جێگیری دەکەن و پشتیان پێدەبەستێت و باسی مەزهەبەکانی تری پەکخەرانی صیفەتەکان ( معطلة ) ناکات .

2_ زۆربەی جار پوختی دەکاتەوە و تەنها یەك بەڵگە دەهێنێتەوە و باسی دەکات بۆ هەر صیفەتێك ، جگە لەهەندێك صیفەت نەبێت کە لەکۆتایی ڕیسالەکەیدا باسی کردووە .

3_ باسی حوکمی ئەو کەسەی نەکردووە کە ئینکاری صیفەتێك لە صیفەتەکان بکات .

4_ گرنگی نادات بە وەڵامدانەوەی مەزهەبی پەکخەران و گفتوگۆکردنی گومانەکانیان .

وا دیارە تەنها بۆ ڕوونکردنەوەی مەزهەبی سەلەف دایڕشتووە بەبەڵگەوە ، ئەوە مەبەستیەتی لەوەدا الله ـش زاناترە ، بۆیە بە ویستی الله هەوڵدەدەین باسی مەزهەبەکانی پەکخەران بکەین چونکە وەك گوتراوە بە دژەکەی شتەکان ڕوون دەبێتەوە .

وە ئێستا دەست پێدەکەین بە ویستی الله بەشێوەیەکی بەش بەش بەباسکردنی ئەوانەی کە نوسەر سەبارەت بە صیفەتەکان باسی کردووە وە هەڵدەستین بە دانانی هەر صیفەتێك بەویستی الله لەسەر شێوەی پرس: دەڵێین و پشتیوان بە الله :

### یەکەم: صیفەتی ڕوو ( الوجه ) بۆ الله تعالی .

### نوسەر فەرموویەتی :

لەو ئایەتانەش کە هاتووە لەبارەی صیفەتەکان وتەی الله تعالی: { وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ } [18] .

### ڕوونکردنەوە :

نوسەر باسی ئەو ئایەتە پیرۆزەی کردووە: ( وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ) [19] ، کورتی کردۆتەوە لەسەر یەك ئایەت ، وە ئایەتی زۆر هەن لە قورئان و فەرموودەی زۆر هەن کە بەڵگەن بۆ صیفەتی ڕوو ( الوجه ) بۆ الله تعالی ، وە لە چاکترین ئەو کتێبانەی فراوانن بۆ ئەو صیفەتە کتێبی ئیمامی إبن خزیمة یە لەکتێبی (التوحید) دا ، وە بەفراوانی قسەی لەسەر کردووە تایبەت فەرموودەکان و سێ پرسی دارشتووە بۆ ئەو صیفەتە ، وە بە نمونەی ئەویش إبن مندە لەکتێبی ( التوحید ) دا ، دەربارەی ئەو صیفەتە قسەی کردووە ، وە بەهەمان شێوە اللالکائي لەکتێبەکەیدا ( شرح أصول اعتقاد أهل السنة ) ، وە پێش ئەوانیش ئیمامی الدارمي لەڕەتدانەوەکەی بۆ طاغوتی جەهمیەکان بشر المریسي ، وە پێش ئەویش کتێبەکانی سوننە وەك ( السنة ) ی عبدالله ی کوڕی ئیمام أحمد و ( السنة ) ی ئیمام الخلال .

**بەڵام بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە دەربارەی صیفەتی ڕوو ( الوجه ) :**

ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوە جێگیر دەکەن کە الله تعالی ڕووێکی وەسفکراوی هەیە بە بەرز و بڵندی و ڕێزداریەوە ، إبن خزیمة لەکتێبی ( التوحید ) دا لەبابەتی جێگیرکردنی صیفەتی ڕوو بۆ الله دەفەرموویت: ئێمە و تێکڕای زانایانمان لە خەڵکی حیجاز و یەمەن و تەهامە و شام بیروباوەڕمان ئەوەیە کە ئەوە جێگیربکەین بۆ الله کە بۆ خۆی جێگیری کردووە بەبێ ئەوەی ڕووی پەروەردگارمان بچوێنین بەڕووی یەکێك لە دروستکراوەکان ، پاشان لە بابەتی دواتردا فەرموویەتی: ئێمە دەڵێین و تێکڕای زانایانیشمان لەهەموو

---

(18) سورة الرحمن: 27 .

(19) سورة الرحمن: 27 .

شـوێنێك كـه پـەرسـتراوی بـەهـەقمـان ڕووێكـی هـەیـە وەك پێـی ڕاگـەیانـدووین لـەوەی دایبـەزانـدووە ( واتـە وەسفكردنی بـەوەی خاوەنـی بـەرز و بڵندییـە ) وە حوكمی بۆی داوە بـەمانـەوە وە نـەفـی كردنـی تیـاچوون بـۆی ، وە دەڵێـین بـۆ ڕووی پـەروەردگارمان هـەیـە ڕووناكی و نورێك كە پەردە لابدات لەسەر حیجابەكەی ئەوا هەموو شتێك دەسوتێنێت كە چاوی دەیبینێت .

**مەزهەبی خەڵكی سەبارەت بە صیفەتی ڕوو ( الوجه ) :**

أ_ مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە ، كە ئەمەیان باسكرا .

ب_ **مەزهـەبی جـەهمیـەكان** كـە بریتیـە لـە پەكخستنی صیفەتـی ڕوو بـۆ الله تعالی و تەئویلـی ئەوە دەكەن كە لەقورئاندا هاتووە سەبارەت ڕووی الله تعالی بەچوار ووشـە: بە **ذات** یان **قیبلە** یان **پاداشت** یانیش **كردەوە چاكەكان** ، وە دەڵێـن: { **وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ** } واتە: ذاتەكەی ، واتا الله خۆی دەمێنێت ، وە دەربارەی فەرمایشتی: ( **إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ** )[20] ، دەڵێن واتە: مەبەستـی پـێ لەبەدەست هێنانی پاداشـت و ڕەزامەندییە ، وە دەربـارەی فـەرمایشتـی: ( **فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ** )[21] ، دەڵـێن واتـە: قیبلــە ، وە الـدارمي وەڵامیانی داوەتەوە لەكتێبەكەیدا ( الرد علی بشر المريسي ) لێكۆڵینەوەی لەتەئویلەكانی جەهمیەكان كردووە و ڕەتی داونەتەوە ڕەدێكی بەهێزی دەم كوتكەر .

ج_ **موعتەزیلەكان**: مەزهەبیان لەصیفەتی ڕوو دا وەك جەهمیەكانە ، نەفی صیفەتی ڕوو دەكەن بۆ الله و تەئویلی دەكەن بە ذات ، یاخود مەبەست لە ڕووی الله بریتییە لە الله خۆی وە ئـەشعەری نـەقڵی كردووە لـە كتێبـەكـەیدا (مقالات الإسلاميين: بـەرگی یـەكـەم لاپەڕە 290) مەزهەبەكانی خەڵكی لەصیفەتی ڕوو و باسی مەزهەبی موعتەزیلەی كردووە وە دراوەتە پاڵ باوكی هذیلي موعتەزیلی كە گوتویەتی: ڕووی الله بریتییە لە الله خۆی ، وە جگە لەئەویش گوتویەتی: ذاتی الله ، وتەكەی كۆتایی پێهات .

(20) سورة الليل: 20 .

(21) سورة البقرة: 115 .

وه لەوانەیە مەبەستی لە نظام بێت کە یەکێکە لە گەورە زانایانی موعتەزیلە ، وە ئەشعەریش شارەزایە لەمەزهەبی موعتەزیلە ، کە چڵ ساڵ لەسەر ئەو مەزهەبە بەردەوام بووە ، لەبەر ئەوە وتەکانی گرنگن بۆ ناسینی بیروباوەڕی موعتەزیلە و ئەوانی تر .
وە کەسی وا هەیە کە خۆی ئەداتە پاڵ سوننەت و فەرموودە و حەنبەلیەکان بەڵام تێکەڵی کردووە ، وە دودڵی کردووە لەصیفەتی ڕوو ، جارێك لێکی دەداتەوە بەتەفسیری موعتەزیلە و جارێکیان بە مەزهەبی مفوضة و جارێکیان بە مەزهەبی سەلەف ، کە ئەویشیان بریتیە لە إبن الجوزية ڕەحمەتی الله ی لەسەر بێت ، لەکتێبەکەیدا ( دفع شبه التشبيه ) مەزهەبی موعتەزیلەی هەڵبژاردووە لە تەفسیرکردنی صیفەتی ڕوو ( الوجه )، وە لەکتێبەکەیدا ( تلبيس إبليس ) چووە بۆ مەزهەبی مفوضة ، وە لەکتێبەکەیدا ( مجالس إبن الجوزي ) چووە بۆ مەزهەبی سەلەف و ئەهلی سوننە ، کە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر دوو دڵی و تێکەڵ کردنەکەی لەسەر ئەو صیفەتە .

د_ **کەللابیەکان**: ئەوانەش وەك ئەهلی سوننە صیفەتی ڕوو بۆ الله جێگیر دەکەن و هەموو صیفەتە ذاتیەکانی الله جێگیر دەکەن وەك: ڕوو و دەست و چاو ، لە دەستپێکەوە لە ئیمامەکەیان عبدالله ی کوڕی سعید کەللاب ، بەهەمان شێوەش ئەشعەری صیفەتی ڕوو جێگیر دەکات بۆ الله هەروەك لەکتێبی ( الإبانة: 32 ) وە ئەشعەری ڕاستی و دروستی ئەوەیە کە کەللابی بووە ، وە ابن حجر باسی ئەوەی کردووە لەکتێبی ( لسان الميزان ) کە کاتێك باسی عبدالله ی کوڕی سعید کەللابی دەکات ، گوتویەتی: وە ئەشعەری لەسەر ڕێچکەکەی ڕۆیشتووە ) .

لەو کەسانەش کە کەللابین کە صیفەتی ڕوو بۆ الله یان جێگیر کردووە ( القلانسي ) و حارثي حاسبي سۆفیگەر ، وە إبن مهدی الطبری و باقلاني ، هەروەکو هەندێکی لەسەردەمیانیش جێگیریان کردووە کە کەللابیەتیان تێدایە وەك: بەیهەقی و إبن فورك ، بەیهەقی لە کتێبەکەیدا " الأسماء والصفات " وە إبن فورك لەکتێبی " مشكل الحديث " کە صیفەتی ڕوو ( الوجه ) یان جێگیر کردووە بۆ الله تعالی .

وە بەیهەقی کاریگەربووە بەکەللابیەکان لەبابەتی صیفەتە ئارەزوومەندیەکانی الله ، وە شێوەی ئەویش شێخەکەی کە بریتیە لە ئیبنو فورك .
وە پوختەی مەزهەبی کەللابیە ڕۆچووەکان یان ئەوانەی کاریگەربووە پێیان لەهەندێك ڕووەوە صیفەتی ڕوو بۆ الله جێگیر دەکەن وەك ئەهلی سوننە و جەماعە .

ج_ **مەزهەبی المجسمة و المشبهة**: ئەوانە صیفەتی ڕوو ( الوجه ) بۆ الله جێگیر دەکەن وەك ڕووی دروستکراوەکان ، پاك و بێگەردی و بەرزی بۆ الله تعالى لەوە ، وە إبن خزيمة وەڵامی داونەتەوە لە کتێبەکەیدا "التوحید" لە بابەتی جێگیر کردنی صیفەتـی ڕوو ، وە باوکی حوسەینی ئەشعەری باسی مەزهەبەکەیانی کردووە لە کتێبەکەیدا مقالات الإسلاميين [22] .

و_ **مەزهەبی ماتوریدییەکان**: ئەوانە صیفەتی ڕوو بۆ الله پەکدەخەن و جێگیری ناکەن ، وە صیفەتی ڕوو تەفسیردەکەن بەتەفسیری جەهمیەکان کە بە واتای ذات ، پاداشت ، قیبلە...... هتد دێت .

ز_ **ئەشعەریەکان**: ئەوانەش دوو بەشن :
1_ ئەشعەریە یەکەمەکان: لەڕاستیدا ئەوانە کەللابین وەك باوکی حوسەینی ئەشعەری و باقلاني وە ئەوانە صیفەتی ڕوو جێگیر دەکەن .
2_ ئەشعەریە دواییەکان: وە ناودەبرێن بە ئەشعەریە ڕۆچووەکان ، ئەوانە صیفەتی ڕوو بۆ الله پەکدەخەن ، وە ئایەتەکانی ڕوو تەفسیر دەکەن بە واتای ذات یانیش پاداشت یانیش کردەوە چاکەکان ، لەگەڵ ئەوەشدا تەفسیرێکی تایبەت بەخۆیان زیاد دەکەن ئەویش بریتیە لە ( ڕازی بوون ) .

**پرسێك:** ئایە هەموو ئایەتێك لەقورئاندا باسی ڕوو ( الوجه ) هاتبێت و درابێتە پاڵ الله ، ئایا لە ئایەتەکانی صیفەتەکانە ؟

(22) 1/290 .

**وەڵام:** بەڵێ ئەوە مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعەیە و یەکدەگرێتەوە لەگەڵ بنچینەکانیان .

**پرسێك:** ئایا ئەو فەرموودانەی هاتووە سەبارەت بە صیفەتی ڕوو و دراوەتەوە پاڵ الله ، ئایا لەفەرموودەکانی صیفەتەکانە ؟

**وەڵام:** بەڵێ ئەم بنەمایەش ئەوەیە گەر الله صیفەتی ڕوو بداتە پاڵ خۆی ئەوا لەبابەتی دانەپاڵی صیفەتێکە بۆ وەسفکراو تەنها لەیەك ئایەت نەبێت کەوا سەلەف ڕاجیاییان هەبووە کە ئایا لە ئایەتی صیفەتەکانە یاخود نا ؟ ئەویش وتەی الله یە: ( **وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ۚ**) [23] ، ئەم ئایەتە ئەهلی بیدعە لێکی ئەدەنەوە وە تەفسیری دەکەن بەتەفسیرێك کە تیایدا صیفەتی ڕوو بۆ الله جێگیر ناکەن ، ئەوەش نامۆ نییە لەو کەسانە ، چونکە صیفەتی ڕوو جێگیر ناکەن بۆ الله لەو ئایەتانەی کە زۆر ڕوونترن لەو ئایەتە ، وەك فەرمایشتی: ( **وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ** ) ، بەڵام سەلەف کە صیفەتی ڕوو جێگیر دەکەن **ڕاجیاییان هەبووە لە لەتەفسیری ئەو ئایەتە لەسەر دوو وتە :**

**یەکەم:** موجاهید و شافعی فەرموویانە و إبن تیمیة هەڵیبژاردووە ، کە لە ئایەتی صیفەتەکان نییە ، بەڵکو مەبەستی لە قیبلەیە ، وە إبن جریر ڕیوایەتی کردووە لە موجاهیدەوە وە إبن تیمیەش باسی کردووە لە فتاوایدا کاتێك کە باسی ناوەندیەتی دەکات کە ئەشعەریەکان ئەو ئایەتەیان بۆ هێناوەتەوە و فەرموویەتی: سەلەف تەفسیریان کردووە بە قیبلە ، وە فەرمووی: ئەو ئایەتە هیچ جێگای ڕاجیایی نییە کە مەبەست لێی قیبلەیە .

**دووەم:** لەئایەتی صیفەتەکانە و بەڵگەیە بۆ صیفەتی ڕوو بۆ الله تعالی ئەوەشیان ئیمام الدارمي هەڵیبژاردووە لەڕەتدانەوەکەی بۆ بشر المریسي وە إبن خزیمة هەڵیبژاردووە لە

(23) سورة البقرة: 115 .

کتێبی " تەوحید " کە لەگەڵ ئەو ئایەتانە باسی کردووە کە بەڵگەن بۆ صیفەتی ڕوو بۆ الله تعالی ، وە إبن تیمیة هەڵیبژاردووە لەکتێبی " الصواعق المرسلة: 2/180 " بەدرێژی باسی کردووە وە وتەکانی هێناوەتەوە و لەکاتی تەفسیرکردنی بە قیبلە پێداگری کردووە لەسەری ئەو وتەیەش ئەوەیە کە بنچینە بەڵگەیە لەبارەیەوە ، بەهۆی ئەوەی صیفەتێکە زیاد کراوە و دراوەتە پاڵ الله تعالی .

وە إبن القیم فەرموودەی زۆری باسکردووە لەوەی کە ئایەتەکە بەڵگەیە بۆ صیفەت کە ئەمەش لێکولینەوەیەکی بەهێزە ، وە ڕاجیاییەکەش ئاسانە لەو بابەتە ، مادەم صیفەتی ڕوو بۆ الله جێگیر دەکەن ، بەڵام لەو ئایەتە ڕێك تەفسیریان کردووە بە قیبلە یاخود شوێن وەك شافعی فەرموویەتی ، وە گومانی تیا نییە کە ئەوەش ووتەی دووەمە واتە کەئایەتەکانی صیفەتەکانە ئەوەشیان دروست ترە و بەهێزترە و داخستنی دەرگای تەئویلی تیایە ، دواتر لەسەر ئەو بنچینەیە دەڕوات کە بریتییە لە صیفەتەکانی زیادکراو بۆ الله تعالی .

**هەندێك بابەت کە پەیوەستە بە صیفەتی ڕوو بۆ الله تعالی** :

1_ ئەوەی هاتووە لە فەرموودەکان سەبارەت بە باسی ( سبحات ) ڕووناکییەکانی ڕووی الله تعالی ، ئایا ( سبحات ) چییە ؟ پێش ئەوەی تەفسیری بکەین باسی ئەو فەرموودانە دەکەین کە باسی ڕووناکییەکان ( سبحات ) ی تێدا هاتووە :

فەرموودەکەی أبي موسی کە مرفوعە: الله تعالی ناخەوێت و پێویستیش ناکات کە بخەوێت ، تاوەك فەرمووی: ( پەردەکەی ڕووناکیێکە ئەگەر لایبدات ئەوا ڕووناکی ڕووی تا کۆتایی بەندەکان کە چاوی دەبینێت دەیسوتێنێت ) [24] .

بەڵام تەفسیری " السبحات " ئەوا ئیمام أبو عبید لەکتێبەکەیدا ( غریب الحدیث ) کاتێك کە قسە لەسەر فەرموودەی: ( پەردەکەی ڕووناکیێکە ئەگەر لایبدات ئەوا ڕووناکی ڕووی

(24) أخرجه مسلم في صحيحه 161/1 (ح179) .

تا کۆتایی بەندەکان کەچاوی دەبینێت دەیسوتێنێت ) فەرمووی: ( السبحة ) واتە ڕێزی و ڕووی و ڕووناکیەکەی [25] .

وە ئیمامی الدارمي لەکتێبەکەیدا ( الرد علی بشر المریسي ) "سبحات" ی تەفسیرکردووە ، فەرموویەتی: "سبحات" واتە جلال و ڕووناکی ، وە جارێکیان فەرموویەتی: ( ئەگەر پەردەکەی لابدات ئەوا ڕووناکی و ڕێزی الله دەیسوتێنێت ) ، وە جارێکی تر فەرمووی: ( ئەگەر شتێك لەشتەکانی دونیا ڕووناکیەکەی الله ببینێت ئەوا دەسوتێت ) .

وە ڕوون دەبێتەوە لە وتەی دوو ئیمامەکە کە ڕووناکی "سبحات" دراوەتە پاڵ ڕووی الله و بەشێکە لەڕووی ، کە لەصیفەتی ڕووە ، بۆیە إبن خزیمة لە کتێبی ( التوحید ) دا دەفەرمووێت: ڕووی پەروەردگارمان نور و ڕووناکی هەیە ئەگەر پەردەکەی لابدات ئەوا ڕووناکی ڕووی هەموو شتێك دەسوتێنێت ، وە إبن خزیمة "سبحات" تەفسیر کردووە بە نور و ڕووناکی ، جا سبحات دەبێتە صیفەتی ڕووی الله ، ئەوەشیان تەفسیری دروستە .

وە لەهەندێك لە ئەهلی سوننە هاتووە کە ( سبحات ) یان تەفسیر کردووە بە نوری ذات وە هەندێکیان تەفسیری کردووە بەنوری دروستکراو ، کە بریتییە لەواتای فەرموودەی : ( الله پەردەی نێوانی لەگەڵ دروستکراوەکانی نور و ڕووناکیە ، وە ئەو ڕووناکیەی کە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) بینی کاتێك کە گواستراوە ، وە پێی گوترا: ئایا پەروەردگاری خۆت بینیوە ؟ پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی: من ڕووناکی دەبینم ) [26] .

وە هەندێکیان تەفسیریان کردووە بە جوانی ڕوو ، وە ئەو تەفسیرەشیان نزیکە لە تەفسیرەکەی إبن خزیمة بەوەی بە واتای ڕۆشنایی دێت چونکە بریتییە لە جوانی ڕوو .

بەڵام تەفسیری سبحات بە نوری ذاتی الله فراوانی تێدایە ، چونکە سبحات دراوەتە پاڵ صیفەتی ڕوو نەك درابێتە پاڵ خودی الله ، وە لە فەرموودەی: ( پەردەکەی ڕووناکیێکە

---

(25) غريب الحديث: 173/3 .

(26) رواه مسلم في صحيحه 161/1 (178) ، وأبو داود في سننه 64/1 (ح474) .

ئەگەر لایبدات ئەوا ڕووناکی ڕووی تا کۆتایی بەندەکان کە چاوی دەبینێت دەیسوتێنێت ) [27] موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە کتێبی ئیمان .
وە ئەوەیشی دروستە لەو بابەتە تەفسیری یەکەمە کە سێ زانای ئومەت لەسەرین أبو عبید و الدارمي و إبن خزيمة ، کەواتە سبحات صیفەتێکە دراوەتە پاڵ ڕوو ، بەڵام تەفسیری دووەم بەوەی نوری ذاتی الله بێت ئەوەیان تەفسیری إبن القيم ــ شێخ عبداللطيف نەقڵی کردووە لە الرسائل والمسائل النجدية [28] ، بەڵام تەفسیر کردنی بە نوری دروستکراوەکان ئەوەیان لاوازە .

2ــ **پرسی پەردە کە الله بەو پەردەیە جیا کراوەتەوە لە دروستکراوەکانی** .
ئەوەشیان پرسێکە هەندێك لە ئەهلی سوننە باسیان کردووە لە باسکردنی صیفەتی ڕوو وە دەیکەن بەو بابەتانەی کە شوێنکەوتە و دوای بەدوایە بۆ صیفەتی ڕوو وەك چۆن الدارمي وای کردووە لە ڕەتدانەوەکەی بۆ بشر المريسي لەسنور دەرچوو .

وە باسی پەردە جێگیربووە لە قورئان و سوننەت ، لە قورئاندا لە وتەی الله تعالی: ( **وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ** ) [29] .
وە لەسونەتدا: هاتوو لە صحيحدا لەفەرموودەی صوهەیب [30] : ( کاتێك کە خەڵکی بەهەشت دەچنە بەهەشت.......... تاوەك فەرمووی: الله پەردەکەی لا ئەبات ) ، دواتر باسی بینینی کردووە کە بەڵگەیە لەوەی حیجابی الله لە بابەتەکانی بینینی ڕووی الله تعالی یە .
وە فەرموودەی أبي موسی کە مەرفوعە: ( حیجابەکەی نورە ) ، وە الدارمي و جگە لەویش ڕیوایەتیان کردووە لە إبن عمرەوە بە مەوقوفی الله بەچوار شت بەو پەردەیەی لەگەڵ بەندەکان جیاکراوەتەوە بە: ئاگر و نور و تاریکی و نور .

(27) پێشتر باسکراوە .
(28) 3/100 .
(29) سورة الشورى: 51 .
(30) پێشتر باسکراوە .

وه هاتووه لەفەرموودەی إبن عمرەوه ، هاتووه له عبدالله ی کوڕی عومەر و به مەوقوفی که الله پەردەدراوه و جیاکراوەتەوه لەگەڵ بەندەکانی به چوار شت ، وه الدارمیش ڕیوایەتی کردووه بەسەنەدەکەی له زرارة کوڕی باوکی ئەوفا بەمەرفوعی که پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) ، پرسیاری کرد لەجوبریل: ئایا پەروەردگاری خۆت بینیوه ؟ پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی: لەنێوانی من و ئەودا حەفتا پەردە هەیه لەنور ، بەیهەقی ڕیوایەتی کردووه له ( الاسماء والصفات ) وه إبن خزيمة له کتێبی ( تەوحید ) .

پوختەی پرسەکە: پەردە ( حجاب ) جێگیربووه وه الله تعالى جیا کراوەتەوه و داپۆشراوه لەگەڵ بەندەکانی بەچەند پەردەیەك ، الله ش زاناتره بەژمارەیان و هەقیقەتەکەیان ئەگەر هاتبێتیش لەهەندێ ئەثەر که چواره یاخود لەهەندێکیان حەفتا هاتووه الله زاناتره ، وه لەڕووی هەقیقەتەکەشیەوه ئەگەر هاتبێتیش لەهەندێك ئەثەر که نوره ، یاخود ئاگر ، یاخود تاریکی ، الله زاناتره .

**3ـ پرسێك: ئایا له صیفەتەکانی ڕوو ئەوەیه که بگوترێت وێنەی بۆ هەیه واته: ڕوو وێنەیەکی دیاریکراوی بۆ هەیه ؟**

هاتووه له فەرموودەی أبو هورەیره به مەرفوعی فەرموویەتی: ( ئەوەی کوشتار دەکات با دوور کەوێتەوه لەلێدانی دەم و چاو ، چونکه وێنەی ڕووی مرۆڤ لەسەر وێنەی ڕووی ڕەحمانه ) [31] .

بەڵام سەبارەت به فەرموودەکە ئەوا ئیبنو ئەبی عاصم و جگە لەویش ڕیوایەتیان کردووه ، بەڵام فەرموودەکە لاوازه ، چونکه ( إبن لهيعة ) ی تیایه که ئەویشیان لاوازه وه لەو بابەتەدا دەڵێین الله زاناتره .

بەڵام سەبارەت به جێگیرکردنی وێنه بۆ الله ئەوا ئەهلی سوننه به تێکڕا و یەکدەنگیەوه وێنه بۆ الله جێگیری دەکەن ، وه ئەو فەرموودەیەش که متفق عليه بەڵگەی داوه

(31) أخرجه البخاري في صحيحه 902/2 (2420) ، ومسلم في صحيحه 2016/4 (2612) .

لەبارەی ئەمە ، فەرموودەکەش بریتیە لە: ( الله ئادەمی دروست کردووە لەسەر وێنەی خۆی )، وە لەڕیوایەتێکی تردا ( لەسەر وێنەی ڕەحمان ) .
وە دروستیش ئەوەیە کەضمیري ( هــ ) لەکۆتایی فەرموودەکە (صورتـه) دەگەڕێندرێتەوە بۆ الله تعالی ، ئەوەشیان هەڵبژاردنی تێکڕای سەلەفە ، وە إبن تیمیة یەکدەنگی نەقڵ کردووە کاتێك لە ( نقض التأسیس ) فەرموویەتی: لەنێوان سەلەف و سێ سەدە باشترینەکان ڕاجیایی نەبووە لەوەی کەضمیري ( هــ ) ەکە دەگەڕێندرێتەوە بۆ الله تعالی ، وە بەفراوانی و تەواوی هاتووە لەچەندین ڕێگا و لە چەندین هاوەڵانەوە ، وە جارێکیان فەرمووی: زانایانی ئوممەت ئینکاریان نەکردووە لەوەی کە گوتنی وتەی الله ئادەمی دروست کردووە لەسەر شێوەی رەحمان بەڵکو یەکدەنگ بوون لەگوتنی ئەو گوتەیە بەو شێوەیە .

وە لەهەندێك سەلەفەوە هاتووە کە ضمیري ( هــ ) یان گێڕاوەتەوە بۆ لای کەسە لێدراوەکە ( واتە کە لەفەرموودەکەدا هاتووە: ئەوەی شەڕدەکات با دوورکەوێتەوە لە لێدانی دەم و چاوی براکەی ) ئەو وتەیەش إبن خزیمة هەڵیبژاردووە لەکتێبی ( التوحید ) بەڵام زۆر لاوازە ، ئەو وتەیەشیان شاراوەیە بەکۆدەنگی سەلەفی پێش ئەو ، وە ئەوەشی ضمیري ( هـ ) گیڕاوەتەوە لەسەلەف بۆ جگە لە الله تعالی وەك: ابي ثور ، وأبي شیخ الأصبهاني ، دکتۆر عبدالله الدمیجی وتەکانیانی هێناوەتەوە لە قسەکردنی لەسەر الشریعة للأجري [32] ، وە وتەی سێیەمیش هەیە لەگێڕانەوەی ضمیري ( هـ ) بۆ ئادەم واتە: الله ئادەمی دروست کردووە لەسەر وێنەی ئادەم ، ئەوەشیان وتەی جەهمیەکان و ئەهلی کەلامە وە دروست نییە گوتنی ، وە ئیمامی أحمد فەرموویەتی: ئەو کەسەی بلێت الله ئادەمی دروست کردووە لەسەر وێنەی ئادەم ئەو کەسە جەهمیە .

(32) 3/1147 .

**پرسێك:** بوخاری ڕەحمەتی الله لەسەری لە صحیحەکەیدا لە تەفسیری سورەتی القصص دا باسی وتەی الله کردووە ( **كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ** ) [33] ، بوخاری فەرمووی: دەگوترێت تەنیا مولکەکەی ، وە دەگوترێت: مەبەست پێی تەنها ذاتی خۆی نەبێت .
ئەمەشیان ناڕوونی تیایە ، ناڕوونیەکەش بریتیە لەتەفسیرکردنی ڕوو بە مولك ، وە تەفسیرکردنی ڕوو بە ویستنی پاداشت یاخود ئیخلاص ، **بەڵام ناڕوونیەکە لادەچێت ئەگەر دوو بابەتمان زانی :**

أ_ بوخاری لەسەر مەنهەجی سەلەفە لە پرسی ڕوودا بەڵکو لەکۆتایی صحیحەکەیدا لەکتێبی تەوحید ، فەرمووی: بابی ئەوەی هاتووە کە هەموو شتێك بەهیلاك دەچێت تەنیا ڕووی الله نەبێت ، وە باسی فەرموودەی پەنا گرتنی بەڕووی الله کردووە ، کە بەڵگەیە لەوەی کە صیفەتی ڕوو بۆ الله جێگیر دەکات .
ب_ بوخاری لە نەقڵ کردنی وتەی ئەو کەسانەی کە ڕوویان تەفسیر کردووە بە مولك ، فەرمووی : ( دەگوترێت ) کە ئەمەشیان شێوەیەکی نەخۆشیە کە بەڵگەیە لەوەی کە ئەو وتەیەی جێگیر نەکردووە ، بەڵکو ڕەحمەتی الله لەسەری بۆ ڕوونکردنەوەی لاوازیەکەی هێناویەتیەوە ، لەوتەکانی پێشووی بوخاریش بۆمان ڕوون دەبێتەوە چاکی کارەکەی ڕەحمەتی الله لەسەری بێت .

وە ئەوەی جێگای سەرسوڕمان و نامۆیە ئەوەیە کە إبن جریر الطبري لەتەفسیری سورەتی القصص کاتێك کە تەفسیری ( **كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ** ) دەفەرمووێت: ڕاجیایی دروست بووە لە واتای ( **إِلَّا وَجْهَهُ** ) ، هەندێك وتەی باسکرد و دواتر فەرمووی : هەندێکیان گوتویانە مەبەست پێی تەنها ذاتی خۆی نەبێت ، وە إبن جریر قسەکەرەکەی نادیار کردووە بەپێچەوانەی عادەتی لەباسکردنی سەنەد بۆ ئەو کەسانەی کە تەفسیریان لێوە دەگوازێتەوە لە سەلەف ، لەگەڵ ئەوەشدا زانراوە کە إبن جریر لەئەهلی سوننەیە وە لەگەورە زانایانی سەلەفە کە ڕوو جێگیر دەکات لەسەر ڕێچکەی سەلەف .

---

(33) سورة القصص: 88 .

## صیفەتی دووەم: صیفەتی هەردوو دەست بۆ الله تعالى

## نوسەر فەرموویەتی :

وە وتەی الله تعالى: ( **بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ** )

## ڕوونکردنەوە :

### پرسی یەکەم :

نوسەر ڕەحمەتی الله لەسەری بێت باسی صیفەتی دووەمی کردووە لە صیفەتەکانی الله تعالى ، کە ئەویشیان صیفەتی هەردوو دەستە ، وە پشتی بەستووە بەیەك ئایەت لەبارەیەوە ، ئەویشیان وتەی الله تعالى یە: ( **بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ** ) [34] ، وە هەڵبژاردنی نوسەر بۆ باسی ئایەتێکی ستایشکردن بەهێزترین وەڵامە لەسەر پەکخەران ( المعطلة ) لەجێگیرکردنی هەردوو دەست بۆ الله وەك چۆن ڕوونی دەکەینەوە بە ویستی الله .

### پرسی دووەم :

صیفەتی هەردوو دەست جێگیربووە بۆ الله تعالى بەبەڵگەی قورئان و سوننەت و کۆدەنگی بەوەی کە دوو دەستی هەیە .

### پرسی سێیەم :

لەصیفەتەکانی دەست ابن القيم باسی کردووە لە مختصر الصواعق [35] ، ئەو لایەنانەی کە صیفەتەکانی دەستی لەبارەوە هاتووە فەرمووی: لەفزی دەست هاتووە لە قورئان و سوننەتدا ، وە وتەی هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان لەزیاتر لەسەد ڕێگاوە هاتووە ، بەشێوازێکی جیا جیا و بڕیاردراو و بەڵگەدەر لەوەی کەبەڵگەیە لەوەی کە دەستێکی هەقیقیە لە دەستگرتن و مست پێچینەوە ، وە فراوانی و تەوقە و پێدان بەدەستی خۆی ، وە ڕشاندن بەدەست و تاوەك فەرمووی: وە دەست پێداهێنان چونکە الله دەستی هێناوە

(34) سورة المائدة: 64 .

(35) 2/171 .

به پشتی ئادەم بەدەستی خۆی وە باسی بەرزبونەوە و دابەزاندن و وە باسی لەرینەوەشی کردووە ، کۆتایی پێهات بە پوختی .
ئەوانی پێشوو بەڵگەن لەوەی کە ئەوشتانە لە کارەکانی دەستن ، وە الله بەدەستی شت دەگرێت و کۆی دەکاتەوە...... تا کۆتایی .

**مەزهەبی خەڵکی لەسەر صیفەتی دەست بۆ الله تعالى** :
1ــ مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە جێگیرکردنی هەردوو دەستە بۆ الله تعالى .
2ــ **مەزهەبی ابن حزم** کاتێك کە دەستی زۆری بۆ الله جێگیر کردووە ، لەکتێبەکەیدا الدرة في ما يجب أعتقاده [36] گوتوویەتی: بۆ الله تعالى هەیە دەستێك و دوو دەست و دەستی تر .
3ــ **مەزهەبی أبو العباس القلانسي رازي كلابي** کە لەسەردەمیانی أبو حەسەنی أشعريە ، گوتویەتی: دەست یەك صیفەتە و دوو صیفەت نییە .

4ــ **مەزهەبی مشبهة** ئەوانەش ئەو کەسانەن کە صیفەتی دەست بۆ الله جێگیر دەکەن وەك دەستی خەڵکی ، نمونەی هشام بن الحكم الرافضي و هشام بن سالم الجواليقي ، وە داود الجواربي .

وە ئەوانەش ناوبراون بەهاشمیەکان کە ئەوانیش رافضیەکانن وە مەزهەبیان بریتییە لە جێگیرکردنی ئەوەی کە الله هەموو ئەندامەکانی مرۆڤی هەیە تەنها ئەندامی ( نێرینە یان مێینە ) و ڕیش نەبێت ، پاك بێگەردی و بەرزی و بڵندی بۆ الله تعالى لەوە .
وە هشامی کوڕی سالم گوتوویەتی: الله تعالى لەسەر وێنەی مرۆڤە و دەست و پێ و گوێ وە لووت و شتی تریشی باسکردووە ، ئەو مەزهەبەش أبو حەسەنی الأشعری باسی کردووە لە مقالات الإسلاميين [37] .

(36) الدرة لإبن حزم لاپەڕە 248 .
(37) 290/1 .

5_ **مەزهەبی المجسمة** ، کە ئەوانیش مقاتلیەکانن هاوەڵانی مقاتل بن سلیمان مەزهەبیان ئەوەیە کە الله تعالی جسم و لاشەی هەیە لەسەر وێنەی مرۆڤ ، وە ئەندامی هەیە لەگەڵ ئەوەشدا بەکەسی تر ناچێت ، الأشعری لەوانەوە باسی کردووە لە مقالات الإسلاميين [38] ، وە **جیاوازی نێوان مشبهەکان و مجسمەکان** یەك جیاوازیە ئەویش ئەوەیە کە مجسمەکان لاشە بۆ الله جێگیر دەکەن وە ئەوەشی لەسەر نەفی دەکەن کە لەکەسی تر بچێت ، وە مشبهەکان ئەوەیە کە جسم بۆ الله تعالی جێگیر دەکەن وە دەیچوێنن بەهی تر .

6_ **مەزهەبی پەکخەران ( معطلة )** لەجەهمیەکان و موعتەزیلەکان و ماتوریدییەکان و ئەشعەریە ڕۆچووەکان واتە ئەشعەرییە دواینەکان ، ئەوانەش نەفی ئەوە دەکەن کە صیفەتی دەست بۆ الله هەبێت و تەئویلی دەکەن بە یازدە تفسیر: توانا ، هێز ، موڵك ، نیعمەت ، دەسەڵات ، بەخشین ، ڕزق ، گەنجینەکان ، بەرەکەت ، کەرامەت ، چاودێری .
7_ **مەزهەبی کەللابیەکان و ئەشعەریە یەکەمەکان** ، ئەوانەش وەك ئەهلی سوننە ، صیفەتی دەست بۆ الله تعالی جێگیر دەکەن و تەئویلی ناکەن .

**پرسێك :**
الله تعالی دوو دەستی هەیە یەکێکیان وەسف دەکرێت بە دەستی ڕاستی و ڕاجیاییان هەبووە لە ناوی دووەم بۆ چەند وتەیەك ، ئەو ڕاجیاییەش لەناو ئەهلی سوننە و جەماعەیە :
**وتەی یەکەم** : دەستی دووەمیش بەهەمان شێوە ناودەبرێت بەدەستی ( ڕاست ) ، کەوا هەردوو دەستی لای ڕاستە ، وە پشتیان بەستووە بەفەرموودەی: ( هەردوو دەستی ڕاستەمینە ) [39] ، ئەوەشیان وتەی ئیمامی احمدە بگەڕێوە بۆ سەر ( طبقات الحنابلة

(38) مقالات الإسلاميين 282/1 .
(39) رواه مسلم في صحيحه 1458/3 (ح1827) ، وأحمد في مسنده 160/2 (ح6492) ، والنسائي (المجتبى) 221/8 (ح5379) .

لأبي يعلي[40] ، فەرموویەتی: وەك چۆن ڕاست هاتووە لەپێغەمبەری الله وە ( صلی الله علیە وسلم ) کەوا فەرموویەتی : ( هەردوو دەستی ڕاستەمینە ) ، ئیمان هێنان بەوەی فەرموویەتی .

وە إبن خزیمة هەڵیبژاردووە لە کتێبی تەوحید دا ، وە ئەو ڕایەی سەرخستووە و نەفی ئەوەی کردووە کە ناوببرێت بە چەپ ، وە لەسەرەتای قسەکەیدا فەرمووی: مەزهەبی ئێمە و مەزهەبی ئەهلی ئەثەر وە باسی جێگیریەتی دەستی کردووە و فەرموویەتی: دەڵێین هەردوو دەستەکەی ڕاستەمینە و چەپیان بۆ نییە ، وە إبن بطة باسی کردووە لە کتێبەکەیدا ( الإبانة ) لە کتێبی ( الرد علی الجهمیة ) وە باسی بابی ئەوەی کردووە کە هەردوو دەستی ڕاستەمینە .

**وتەی دووەم** : ناودەبرێت بە چەپە ( واتە: دەستی دووەم ) وە پشتیان بەستووە بەو فەرموودەیەی موسلیم ڕیوایەتی کردووە لەفەرموودەی إبن عمر کە فەرموویەتی: ( زەوی هەڵدەپێچێتەوە بەدەستی چەپی )[41] ، وە هەریەکە لە الدارمی و شیخ محمد بن عبدالوهاب بۆی چوون لەکۆتاییەکانی کتێبی تەوحید وە أبي یعلی لە کتێبی ( إبطال التأویل ) وە الدارمی ئەوەشی زیاد کردووە کە بەهەمان شێوە ناودەبرێت بە ( یسار ) ، واتە ( شمال یاخود یسار ) وە لەسەر ئەوە پشتیان بەستووە بەفەرموودەکەی سلمان لەجێگیر کردنی ناوبردنی بە ( شمال ) ، فەرموودەی: ( الله قوڕی ئادەمی تێکەڵ کردووە بە دەستەکانی ، هەموو پاکێکی دەرهێناوە بە دەستی ڕاستی ، وە هەموو ناپاکێك بەدەستی چەپی ) ، بەڵام پشت بەستنیان بەناوبردنی دەستەکەی تر بە ( یسار ـ چەپ ) ئەویشیان فەرموودەکەی ابي درداء ـە بە مەرفوعی: ( الله ئادەمی دروست کرد و کاتێك دروستی کرد لەشانی ڕاستی ئادەمی دا نەوەیەکی سپی لێوە دەرهات ، هەتاوەکو

(40) 1/313 .

(41) رواه مسلم في صحيحه 2148/4 (ح2788) .

فەرمووی: ( وە لە شانی چەپیشی دا و بەوەی لەلای ڕاستی گوت بۆ بەهەشت و باکم نییە ، وە بەوەی لای چەپیشی گوت بۆ دۆزەخ و باکم نییە ) [42] .

**وتەی سێیەم :**

ئەوەیە کە دەستی دووەم ناودەبرێت بەدەستەکەی تر و ناونانرێت بە لای ڕاست یان لای چەپی ، بەڵکو دەگوترێت دەستەکەی تری ، وە بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئەوەیە کە ابو داود ڕیوایەتی کردووە لەفەرموودەی ابن عمر: ( دواتر هەردوو زەویەکان دەپێچێتەوە بەدەستەکەی تری ) .

**وە ئەوەی ڕای دروستە لە بابەتەکە:** وتەی یەکەمە ، ئەویش ئەوەیە کە دەستی دووەم ناوببرێت بە لای ڕاست ، بەڵام وەڵامدانەوەی بەڵگەی ڕاجیایان ، فەرموودەکەی إبن عمر لای موسلیم لە باسی چەپ ( شمال ) جا وەسفی شیمالەکە شازە ، عمرو بن حمزة بەتەنها هێناویەتییەوە وە بەیهەقیش لاوازی کردووە لە الأسماء والصفات [43] .

وە نافع و عبدالله بن مقسم فەرموودەکەی إبن عمریان ریوایەت کردووە کە لەلای بوخاری و موسلیمە و باسی ( شمال ) ی تێدا نەهاتووە ، بەڵام سەبارەت بەفەرموودەی سلمان کە هەموو ناپاکیەکی بە دەستی چەپی ( شمال ) دەرهێنابێت ، ئەوەیان بەیهەقی بە لاوازی داناوە لە الاسماء والصفات لاپەڕە 327 ، بەڵام فەرموودەی ابي درداء: ( وە بەوەی لای چەپی ( یسارە ) گوت ) نەمانتوانی لێکۆڵینەوە بکەین لە ڕاست و دروستی فەرموودەکە ، بەڵکو دواتر ئاسان بێت بۆمان بۆ ئەوەی لێی بکۆڵینەوە .

**صیفەتی پەنجەکان ( الأصابع ) بۆ الله تعالى وە کێ جێگیری دەکات :**

هەندێك لە ئەهلی زانست پەنجەکان دەکەن بەبەشێك لە دەست وە پەنجەکان دەکەن بەبەشێك لەصیفەتی دەست ، چونکە ئەوە بەڵگەی زمانی عەرەبیە ، ئەوەشیان ئەوەیە کە کەسی عەرەب تێی دەگات کاتێك کە ئەوەی پێ بگوترێت .

---

(42) رواه أحمد وعبدالله بن أحمد في السنة 1059 ، والبزار برقم (2) ، 441/6 .

(43) ص 324 .

بەڵام چاکتر وایە دوورکەوتنەوە بکرێت لەو بابەتە ، وە بێدەنگی هەڵبژێردرێت لەوەی پەنجەکان بدرێتە پاڵ دەست ، بەڵکو پێی دەگوترێت لەپەنجەی هەیە یاخود پەنجە هەیە بۆ الله ، هەر بۆیە سەلەف دەفەرموون: جێگیرکردنی پەنجەکان بۆ الله وە نالێین جێگیرکردنی پەنجەکان بۆ دەستی الله ، وە پەنجەکان بدرێتە پاڵ الله وتەیەکی دەقیق تر وە پارێزراوترە ، لەگەڵ ئەوەشدا وتەی یەکەم بەهێزییەکی هەیە کە لەلایەنی بەڵگەدانی لەزمانی عەرەبیەوە ، بۆیە یەکەمیان بەڵگەکەی بەهێزترە وە دووەم پارێزراوترە بۆ ئەو کەسەی گومانی لا لەسەری دروست ببێت ، وە داواکارین لە الله کە لەقسەکانمان هیچ شتێك لەزیادەڕۆیی و قوڵیەتی ڕێگەپێنەدراوی تیا نەبێت ، وە داوای لێخۆشبوون لە الله دەکەین و تەوبە دەکەین بۆ لای الله وە الله ـش زاناترە .

بەڵام جێگیربوونی پەنجەکان بۆ الله تعالی هاتووە لە سوننەتدا لە فەرموودەی ڕاست و دروستدا لەوانەش فەرموودەی: ( ئاسمانەکان دادەنێت لەسەر یەك پەنجە ) [44] ، وە ئەویشیان لە صحیح دایە لە فەرموودەی إبن مسعود ( الله لێی ڕازی بێت ) بەهەمان شێوە فەرموودەی: ( دڵەکان لەنێوان دوو پەنجە لەپەنجەکانی ڕەحمانن ) ، وە ئەهلی سوننە و جەماعە کۆدەنگن لە جێگیرکردنی پەنجەکان بۆ الله تعالی لەسەر ئەو شێوەیەی کە شیاوی خۆیەتی .

**مەزهەبی خەڵکی لە جێگیر کردنی پەنجەکان دەبنە چەند بەشێك :**

1_ مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوانیش لەسەر جێگیرکردنی صیفەتی پەنجەکانن بۆ الله تعالی .

2_ ئەوانەی کە تەئویلی پەنجەکان دەکەن وەك تەئویل کردنی دەست ، تەوئویلی دەکەن بە: توانین و مولك......هتد ، ئەوەشیان مەزهەبی جەهمیەکان و موعتەزیلەکان و دواینەکانی ئەشعەریەکان و ماتوردییەکانە ، وە هەندێکی تریش کەدەستیان جێگیرکردووە دێنە ناویانەوە وەك باسمان کرد بەڵام صیفەتی پەنجەکانیان تەئویل کردووە وەك بەیهەقی و شێخەکەی کە بریتیە لە إبن فورك .

(44) رواه البخاري في صحيحه 1812/4 (ح4533) ، ومسلم في صحيحه 4/ 2147 (2786) .

3_ ئەوەی ئینکاری لەجێگیرکردنی پەنجەکان بۆ الله کردووە وە نەفی ڕاستیەتی هاتنی بەڵگەکەی کردووە وەك خطابي ، سفارینی لێیەوە نەقڵ ئەکات لەعقیدەکەیدا لەبەرگی یەکەم کاتێك کە قسە لەسەر صیفەتی پەنجەکان بۆ الله دەکات .

**پرسێك: ژمارەی پەنجەکان و ئایا ڕادەیەکی دیاریکراو لەپەنجە بۆ الله تعالی جێگیر دەبێت وەك چۆن جێگیرمان کرد کە دوو دەستی هەیە ؟**

ئەوەی کە هاتووە لە فەرموودەکەی إبن مسعود پێنج پەنجەیە ، وە لەفەرموودەی وەرگێڕانی دڵەکان باسی دوو پەنجە هاتووە ، بۆیە ئەو ژمارانە جێگیر دەکەین چونکە ڕاست هاتوون ، وە دەڵێین: ئیمانمان هێنا لەوەی هاتووە لەلایەن الله وە لەسەر مەبەستی الله و بەوەش کە لەپێغەمبەرەوە ( صلى الله عليه وسلم ) هاتووە لەسەر مەبەستی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم )، وە بێدەنگ دەبین لەدیاریکردنی ڕادەیەك یان ژمارەیەك ، وە دەڵێین: الله زاناترە ، وە ئەوەمان بەسە کە بەس بوو بۆ پیشینانمان لەوازهێنان لەدیاریکردنی ژمارە و ڕادە لەگەڵ جێگیر کردنی ئەوانەشی کە هاتوون .

**پرسێك: ناو لەپ ( الكف ) :**

ئەهلی سوننە و جەماعە لەسەر ئەوەن کە ناولەپ بۆ الله تعالی هەیە ، وە پشتیان بەستووە بەو فەرموودەی موسلیم ڕیوایەتی کردووە کە باسی بەخشینی کردووە ، فەرموویەتی: ( هەرکەسێك شتێك ببەخشێت ...... تاوەك فەرمووی: ( چاوەڕیی زیاتر بکەن لەناو لەپی ڕەحمان ) [45] ، وە ئەهلی سوننە و جەماعە ناولەپ بۆ الله تعالی جێگیر دەکەن ، بەڵام پەکخەران ( المعطلة ) تەئویلی دەکەن وەك تەئویلی دەست .

**پرسێك: ئایا دەگوترێت دەست بریتیە لە ناولەپ یاخود جیاوازی هەیە لە نێوانیان ؟**

لەسەر ئەو پرسە شتێکی وام بیر نایەت لەسەلەفەوە تا ئێستا ، بەڵکو الله ئاسانی کات بۆ دوایی ، بەڵام لەلایەنی زمانی عەرەبیەوە هەندێك جار وشەی ناولەپ ( الكف )

(45) رواه البخاري 511/2 (ح1344) ، ومسلم 702/2 (1014) .

بەکاردێنن وشەی دەست واتاشیان وەك یەك دەبێت وە هەندێك جار دەست بە فراوان تر دادەنێن لە ناولەپ ( الكف )، بەڵام سەبارەت بە الله تعالی ئەوەیان پێویستی بەپێویستی بەبەڵگەیە لەقورئان و سوننەت یاخود وتەی سەلەف ، بەڵام بیرمان نەچێت کە قورئان و سوننەت لەسەر زمانی عربی دامەزراوە وە بەو شێوەیە هاتووە کە عەرەب تێی دەگات ، وە کەسی عەرەب بەو شێوەیە لە ناولەپ دەگات کە لەسەر ڕۆشتوون و ناسراوە ، وە بەهەمان شێوە لە نینۆك و پەنجەکان ئەوەشیان لەڕووی واتاوە ، بەڵام چۆنیەتییەکەی نازانرێت بەڵکو لەشتە نادیارەکانە کە جگە لە الله کەسی تر نایزانێت ، وە قسەکەمان لێرە وەك ئەو قسەیەی پێشوومانە لەسەر پرسی پەنجەکان .

**پرسێك: نینۆکەکان ( الأنامل ) : ئایا جیگیری دەکەین بۆ الله تعالی ؟**

ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوە جێگیر دەکەن چونکە هاتووە لەو فەرموودەی کە احمد و ترمذی و ابن خزیمة ڕیوایەتیان کردووە کە ئەویشیان فەرموودەیەکی صحیحە وە ناودەبرێت بەفەرموودەی ( اختصام الملأ الأعلى ) ، پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( بینیم الله ناوڵەپی دانا لەنێوانی هەردوو شانم تاوەك هەستم بە ساردی نینۆکەکانی کرد لەسینگم دا )[46] .

وە ئەوەی شایەدە و وەردەگیرێت لەوتەی ( نینۆکەکانی ) داویەتییە پاڵی لەڕووی دانەپاڵی صیفەتێك بۆ وەصفکراو ، وە إبن تیمیة نینۆکەکانی بۆ الله جێگیر کردووە لە وەڵامدانەوەکەی بۆ الرازی لە کتێبەکەیدا ( نقض أساس التقديس ) کاتێك کە الرازی تەئویلی نینۆکەکانی کرد بەچاودێری )[47] .

وە لەو فەرموودەیەشدا بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی ناولەپ بۆ الله تعالی بەڵام ژمارەی نینۆکەکان سەیر دەکرێت ئایا هیچ شتێك لەسەلەفەوە هاتووە سەبارەت بەو باسە ئەوا جێگیر دەکرێت ، ئەگەرنا لەو شوێنە دەوەستین کە ئەوان لێی وەستاون ، وە بەهەمان

(46) رواه أحمد في مسنده (21604) .

(47) بگەڕێوە بۆ کتاب صفات الله ، تألیف: علوي السقاف .

شێوە ژمارەی ناولەپ ئایا دەگوترێت کە الله دوو ناولەپی هەیە وەك چۆن دوو دەستی هەیە ، وە ئایا دەگوترێت کە ناولەپێکی لای ڕاستە ؟ وەڵام: ئەگەر شتێك هاتبێت لەسەلەفەوە لەسەر ئەو باسە ئەوا ئەوە دەڵێین کە ئەوان گوتویانە ئەگەر نەهاتبێتیش لەو شوێنە دەوەستین کە ئەوان تیایدا وەستاون ، بەڵام ئێستا ئەوا هیچ شتێکم بۆ نایەت لەو بارەیەوە .

**پرسێك: باسك و باڵ ( الساعد والذراع ) : ئایا باسك و باڵ بۆ الله جێگیر دەبێت ؟**

ئەو پرسە تا ئێستاش لەبارەی لێکۆڵێنەوەدایە ، وە بەیهەقی قسەی کردووە لەسەر فەرموودەکانی باڵ لەکتێبەکەیدا ( الأسماء والصفات ) گوتی: بابەتی باسکردنی باسك و باڵ پاشان بەسەنەدەکەی فەرموودەیەکی باسکردووە ئەویش ( باسکی الله بەهێزترە لە باسکی تۆ ، وە بڕینی الله خێراترە لەبڕینی تۆ ) وە تەفسیری کردووە بە توانا و هێز ، وە گوتی: ئەوەش ڕوون دەبێتەوە کە واتای ( موساە ) واتە: بڕینی خێراترە لەبڕینی تۆ ، دواتر باسی فەرموودەکانی باڵی هێناوەتەوە وەك: ( ئەستوری پێستی کافر چل و دوو باڵە بە باڵی خاوەن الله ) وە فەرموودەی: ( مەلائیکەتی دروستکردووە لە نوری دوو باڵەکە ) وە نەیخستۆتە ژێرباری صیفەت بۆ الله تعالی ، بە پوختی ، ئەوەشیان دروستە چونکە فەرموودەکانی باسی باڵ نەدراوەتەوە پاڵ الله .

وە شێخ مرعی المقدسی لەکتێبەکەیدا ( أقاویل الثقات لاپەڕە 163 ) گوتویەتی: بەڵام باسك و باڵ ئەوە القورطبي گوتوویەتی: بەیهەقی و جگە لەویش ئەو سەنەدەیان داوەتە پاڵ فەرموودەی: ( باسکی الله بەهێزترە لە باسکی تۆ ........ هتد وە بەیهەقی باسی فەرموودەی: ( لە نوری دوو باڵەکە دروست کراوم ) و مرعی فەرموویەتی: باڵ بەبێ سنوری هاتووە و نەدراوەتە پاڵ الله ، وە گوتوویەتی: بە باسك دەگوترێت: هێز و بەڕێوەبردن و گوتوویەتی : وە ئەو وتەیەی خستوتەڕوو ( بڕینی الله خێراترە لەبڕینی تۆ ) واتە : ( بڕینی الله لە مەقدوراتەکانی خێراترە لەبڕینی تۆ ) .

وە هەندێك لەنوسەران باسی ئەوەیان کردووە کە أبا یعلی الحنبلی باسی باسکی کردووە لەکتێبەکەیدا ( إبطال التأویلات ) بەڵام نەمدۆزیەوە لەو بەشانەی کە لای من هەبوون ، الله ـش زاناترە ، بەڵام سەبارەت بە باڵ ئەوە ابو یعلی بۆ ئەوە چووە کەوا باڵ صیفەتێکە لەصیفەتەکانی الله (204/1) تەحقیقی حمود ، وە ئایا باڵ بە واتای باسك دێت لەلای ابی یعلی جا بەو هۆیە باسکی جێگیر کردبێت ؟ ، الله زاناترە .
ئەوەندە بوو کەتوانیمان کۆی بکەینەوە ، وە تاوەك ئێستا بابەتەکە پێویستی بە گەڕان و لێکۆلینەوەی زیاترە ، وە تا ئێستاش پێویستی لە نەفسدا هەیە تاوەك سەیری زیاتر بکات ، بەڵکو الله ئاسانی بکات بۆ لێکۆڵینەوەیەکی فراوانتر .

**پرسێك:** ئەویش ئەوەیە هەندێك فەرموودە و ئایەت کە پەیوەستن بەو بابەتەوە وە ڕاجیایی تیایە ئایا لە ئایەتەکانی صیفەتەکانە یاخود نا ؟
1_ الله تعالی دەفەرمووێت: ( **وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ** ) [48] ، ئەو ئایەتە لەئایەتەکانی صیفەتەکاندا نییە هۆکارەکەش ئەوەیە چونکە دەست نەدراوەتەوە پاڵ الله تعالی بەپێچەوانەی ئایەتەکانی صیفەتەکان ، لەسەر ئەوەش ئێمە جێگیربوونی دەست دەڵێین و جێگیری دەکەین بۆ الله تعالی .

2_ فەرموودەی: ( بەردەڕەشەکە دەستی ڕاستی الله تعالی یە لەسەر زەوی ) [49] ، ئەو فەرموودەیە الدارمی قسەی لەسەر کردووە لەڕەتدانەوەکەی بۆ بشر المریسی ، وە فەرمووی : بەدڵنیایەوە ئێمە دەزانین کە بەردەڕەشەکە خودی دەستی ڕاستی الله نییە ، بەڵکو دەستی ڕاستی الله لەگەڵ خۆیەتی لەسەر عەرش ، وە تەئویلی لای ئەهلی زانست ئەوەیە کە : ئەوەی دەستدێنێت بە بەردەڕەشەکە وەك ئەوە وایە تەوقەی لەگەڵ الله کردبێت ، کۆتایی پێ هات .

(48) سورة الذاريات: 47 .
(49) المستدرك على الصحيحين 627/1 (1681) ، صحيح ابن خزيمة 221/4 (2737) .

## صیفەتی سێیەم: صیفەتی نەفس بۆ الله تعالی

**نوسەر فەرموویەتی:** وە وتەی الله هەواڵێکە دەربارەی پێغەمبەر عیسی ــەوە علیه السلام کەوا فەرموویەتی: ( **تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ** )

## ڕوونکردنەوە :

نوسەر باسی یــەك ئایەتی کـردووە بۆ کردنە بەڵگــە لەسەر جێگیرکردنی ئــەو صیفەتە بۆ الله تعالی ، وە ئەهلی سوننە و جەماعە صیفەتی نەفس بۆ الله تعالی جێگیر دەکەن ، بـەڵام بەڵگـە لەسەر ئـەوە ئەوەیـە کەوا نوســەر باســی نەکـردووە ، وتـەی الله تعالــی : ( **وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ** ) [50] ، وە وتەی: ( **كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ** ) [51] ، وە فەرموودەی قودسـی: ( مـن سـتەمـم حـەرام کـردووە لـەسـەر نـەفسی خـۆم ) [52] موسـلیم ڕیوایـەتـی کردووە ، وە فەرموودەی : ( ئەگەر لەنەفسی خۆیدا یادم بکاتەوە ئەوا لەنەفسی خۆم یادی دەکەمـەوە ) [53] متفق علیه .

ئەوە نەبێت کە سەلەف ڕەحمەتی الله لەسەریان ڕاجیاییان هەبووە کە مەبەست چییە لە صیفەتی نەفس دوای ئەوەی کەنەفسیان جێگیر کردووە بۆ الله تعالی ، **لەسەر دوو ووتە** :

### وتەی یەکەم :

نەفس بە واتای ذاتی ئیلاهیە بەصیفەتەکانیەوە ، ئەوەشیان ابن تیمیة هەلیبژاردووە ، وە لـە الفتـاوی [54] گوتوویـەتـی: نـەفسـی بریتییـە لـە ذاتـی پیـرۆزی ، وە لـە الفتـاوی [55] گوتویەتی: وە مەبەست لەنەفس شتێك خودی خۆی بێت و بەدیاریکراوی ، دواتر پشتی

---

(50) سورة آل عمران: 28 .

(51) سورة الأنعام: 12 .

(52) رواه مسلم في صحيحه 1994/4 (ح2577) .

(53) رواه البخاري في صحيحه 2694/6 (ح6970) ، مسلم صحيحه 2061/4 (ح2675) .

(54) 14/196 .

(55) 292/9 وما بعدها .

بەستووە بەئایەتی: ( **تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ** ) [56] ، وە وتەی: ( **كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ** ) ، وە ئایەتی: ( **وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ** ) وە باسی فەرموودەی: ( ئەگەر لەنەفسی خۆیدا یادم بکاتەوە ئەوا لەنەفسی خۆم یادی دەکەمەوە ) ، وە گوتی: نەفس لەو حاڵەتە و بابەتانەدا بە واتای ذاتی وەصفکراو بەصیفاتەکانیەوە دێت لای جمهوری زانایان ، وە ذاتیش لە صیفەتەکاندا نابێتەوە وە نە مەبەستیشی لێی صیفەتی ذاتە ، وە کۆمەڵەیەك لە خەڵکی دەیخەنە ناو لایەنی صیفەتەکان وەك کۆمەڵەیەك وا گومان دەبەن کە بریتییە لەو ذاتەی تاکە لە صیفەتەکانەوە هەردوو وتەکە هەلەن . کۆتایی پێ هات .

وە هەڵبژاردنەکەی ابن تيمية پیچەوانەی ڕاستیە وەك چۆن باسکردنی دێت بە ویستی الله تعالى .

**وتەی دووەم :**

ئەوەیە کە نەفس صیفەتێکە لەصیفەتەکانی الله وەك صیفەتەکانی تر وە إبن خزيمة ئەو وتەیەی هەڵبژاردووە لە کتێبی تەوحید دا ، وە ابن قدامة لەو کتیبەیدا - لمعة الأعتقاد - وە عبدالغني المقدسي هەڵیبژاردووە لەعەقیدەکەیدا ، وە أبو يعلى هەڵیبژاردووە لە کتێبەکەیدا إبطال التأويلات [57] ، وە پشتیان بەستووە بەوەی کە بەو شێوەیە هاتووە کەوا دراوەتە پاڵ الله لە ڕووی دانەپاڵی صیفەت بۆ وەصفکراو ، وەك لەو ئایەتەی کە نوسەر هێناویەتییەوە : ( **وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ** ) وە وتەی: ( **كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ** ) [58] .

ئەوەشیان دروسترینە لەو پرسە کە نەفس صیفەتێکە لە صیفەتەکانی الله .

(56) سورة المائدة: 116 .

(57) 2/442 .

(58) سورة الأنعام: 54 .

**پرسێك: مەزهەبی پەكخەران لە صیفەتی نەفس بۆ الله تعالی :**
ئەوان صیفەتی نەفس بۆ الله تعالی جێگیر ناکەن ، وەك صیفاتەکانی تر ، وە پەكخەران هەموویان لە جەهمیەکان و موعتەزیلەکان و کەللابیەکان و ئەشعەریەکان نەفس تەفسیر دەکەن لە ئایەتەکانی پێشوودا بە واتای ذات ، وە جیاوازی نێوان قسەی ئەوان و قسەکەی إبن تیمیە: ئەوان دەڵێن نەفس بەتەنها ذاتێکە ، وە ابن تیمیە دەڵێت: نەفس بە واتای ذات دێت کە وەسفکراوە بە صیفەتەکانی .

**پرسێك: ( تەنها لە ڕووی گواستنەوەیەوە باسمان کرد ) :**

**صیفەتی نەفس: ئایا بۆ الله جێگیر دەبێت یاخود نا ؟**
چەند فەرموودەیەك هاتوون لەبارەیەوە لەوانەش فەرموودەی أبي هريرة بە مەرفوعی: ( هەرکەسێك ناخۆشیەك لەناخۆشیەکانی دونیا لەسەر موسڵمانێك ئاسان بکات الله تعالی ـش ناخۆشیەك لە ناخۆشیەکانی قیامەتی لەسەر ئاسان دەکات ) [59] رواه مسلم .
وە فەرموودەی أبي بن كعب بەمەرفوعی: ( لە ڕێگیری قسە گوتن بەڕۆژگار چونکە نەفسی ڕەحمانە ) [60] صححه الترمذي .
وە واتای نەفس: ( تنفیس ) ئاسان کردن ، وەك أیو یعلی لە إبطال التأویلات [61] فەرموویەتی: ( تنفیس ) لە کردەوەکانی الله یە وەك لابردنی ناخۆشی و دەرگالێکردنەوە ئەویش لە صیفەتەکانی الله یە کە دەچێتە ژێر ویست و ئارەزووی الله تعالی وە .
وە لەوانەش وتەی پێغەمبەر علیە السلام : ( من هەست بە نەفسی ڕەحمان دەکەم لێرەوە - ئاماژەی دا بۆ لای ڕاست - ) [62] .

(59) رواه مسلم في صحيحه 2074/4 (ح2699) ، وأبوداود في سننه 287/4 (ح4946) ، والترمذي في سننه 34/4 (ح1425) .
(60) أخرجه النسائي في السنن الكبرى 231/6 (ح10769) ، والترمذي في سننه 521/4 (ح2252) .
(61) 1/250 .
(62) رواه الطبراني في الكبير 60/7 ، ورواه البزار في المسند ، راجع: كشف الأستار (1689) ، ورواه البيهقي في كتاب الأسماء والصفات 209/2 ، وحديث رواه في المسند 541/2 ، بلفظ: "وأجد نفس ربكم من قبل اليمن".

ئەو فەرموودانەش: ئەوەی تێبێنی دەکرێت ئەوەیە کە نەفس دراوەتە پاڵ الله ، جا ئایا دەچێتە ژێرباری دانەپاڵی دروستکراو بۆ دروستکەر یاخود لەڕووی دانەپاڵی صیفەتە بۆ الله تعالی ؟ یاخود دەگوترێت دراوەتە پاڵ الله بەڵام شێوەکانی نێوان دانەپاڵەکەی وەکو ئەوەیە کە دەلێت بەردە ڕەشەکە لای ڕاستی الله یە دوای ئاوا تەفسیر کراوە .

خاوەنی کتێبی ( صفات الله ) نوسەری علوی السقاف کە لەبابەتی أسماء والصفاتدا بیروباوەڕی سەلەفیەتە ( پێشین ) لەلاپەڕە 256 باسی ئەوەی کردووە کە لە بابی صیفاتەکانە ، گوتوویەتی: لەژێرباری صیفەتە کردارییەکانە بۆ الله ، وە واتای نەفس بە واتای: ئاسان کردن و لابردن دێت وەك : لابەری الله هات ، لابەری ناڕەحەتی الله .

وە نەفسیان جێگیر کردووە بە واتای تنفیس ( ناخۆشی لابەر ) هەریەکە لە ابي يعلى [63] وە هەڵیبژاردووە وە باسی ئەوەی کردووە کە ئەوەشیان هەڵبژاردنی شێخەکەیەتی کە باوکی عبدالله یە ، والأزهري [64] ، وە ابن قتيبة هەڵێبژاردووە [65] کە ( النفس ) بە واتای ( التنفيس ) دێت وە ( الفرج ) وە ناخۆشی و بەڵا لادەر ( التفريج ) .

(63) في إبطال التأويلات 1/ 250 .

(64) في تهذيب اللغة 13/ 9 .

(65) في كتابه تأويل مختلف الحديث ص 249 ، ط. المكتب الإسلامي .

**صیفەتی چوارەم و پێنجەم: صیفەتی هاتن ( المجيء والإتيان ) بۆ الله تعالى**
**نوسەر فەرموویەتی:** وە وتەی الله تعالى: ( **وَجَاءَ رَبُّكَ** ) وە وتەی الله: ( **هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ** )

**ڕوونکردنەوە**

ئەهلی سوننە و جەماعە هاتن ( المجيء ) بۆ الله جێگیر دەکەن ، الله تعالى فەرموویەتی: ( **وَجَاءَ رَبُّكَ** ) [66] ، وە بەهەمان شێوە ( الإتيان ) هاتن بۆ الله جیگیر دەکەن ، الله فەرموویەتی: ( **هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ** ) [67] ، بریتییە لەو صیفەتانەی کە پەیوەستە بە ویست و ئارەزووی الله وە ، هەر کاتێك بیەوێت دێت .

**پرسێك: مەزهەبی پەکخەران سەبارەت بەو دوو صیفەتە :**
هەموو پەکخەران ئینکاری لەو صیفەتە دەکەن وە تەفسیری ( المجيء والإتيان ) دەکەن **بەچەند تەفسیرێك :**

1_ **الإتيان**: واتە هاتنی فەرمانی الله تعالى ، بۆیە دەڵێن ( **وَجَاءَ رَبُّكَ** ) لابردنی تیایە وە واتاکەی: فەرمانی پەروەردگار هات .
وە وتەی الله: ( **إِلَّا أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ** ) واتە: فەرمانی الله ، گوتیان بەبەڵگەی وتەی الله تعالى : ( **هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن تَأْتِيَهُمُ الْمَلَائِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ أَمْرُ رَبِّكَ** ) [68] .

2_ یاخود هاتن ( **الإتيان والمجيء** ) تەفسیر دەکەن بەهاتنی هەندێك لەدروستکراوەکان بۆیە واتای پەروەردگارت هات ، واتە: مەلائیکەتەکانی پەروەردگارت یاخود سزای پەروەردگارت وە ئەو قسانەیان هەمووی باطڵ و بێ بنەمایە .
ئایەتەکان ڕوونن لە جێگیرکردنی هاتن ( **المجيء والإتيان** ) بۆ الله تعالى .

(66) سورة الفجر: 22 .
(67) سورة البقرة: 210 .
(68) سورة النحل: 33 .

**پرسێك: ئایا ( المجيء ) و ( الإتیان ) یەك صیفەتن یاخود نا ؟**
ڕووکەشی دابەشکردنەکەی نوسەر ئەوەیە کە کردویەتییە دوو صیفەت ، چونکە عادەتی ئەوەیە کە ئایەتێکی هێناوەتەوە بۆ هەر صیفەتێك ، وە لێرەشدا کردوویەتی بە دوو ئایەتی سەربەخۆ .
وە هراس لەشەرحەکەیدا بۆ ( النونية ) باسی ئەوەی کردووە کە دوو صیفەتن ، بەهەمان شێوە لەشەرحی ( العقيدة الواسطية ) گوتویەتی دوو صیفەتن وە علوی السقافیش قسەی ئەوی کردووە لە کتێبی ( الصفات لله ) لەلاپەڕەی 38 کە دوو صیفەتن ، وە بەهەمان شێوە شێخ عبدالعزيز الرشيد ڕوونکەرەوەی الواسطية کەوا ناونراوە بە (التنبيهات السنية ) باسی ئەوەی کردووە کە دوو صیفەتن لەلاپەڕە 89 ،88 ، گوتوویەتی: ئایەتەکان سودی ئەوەیان تیایە لەجێگیرکردنی کردەوە ئارەزوومەندییەکان بۆیە هاتن (الإتیان والمجيء ) و دابەزین و بەرزبوونەوەی و هەمووی جۆرێکە لە کردەوەکانی .
ئەوەشی کە من دەیبینم - الله ش زاناترە - هەردووکیان یەك صیفەتن و دوو صیفەت نین ، **وە بەلگەش بۆ ئەوە :**

1_ ئەو کەسەی جیاوازی کردووە لەنێوانیان پشتی بەستووە بە ئایەتی: ( **هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ** )، وە بۆ ( **المجيء** ) بە ئایەتی: ( **وَجَاءَ رَبُّكَ** )، وە هۆکاری هەردوو هاتنەکە ( **المجيء والإتیان** ) یەك هۆکارە ، ئەویش بۆ ئەوەیە کە یەکلایی کردنەوەی بڕیارە لەنێوان دروستکراوەکان لەڕۆژی قیامەتدا ، بەو شێوە هاتنی ( **المجيء** ) لە ئایەتەکەدا هەمان واتای هاتنی ( **الإتیان** ) ـە ، چونکە هەتووە بۆ یەك شت ئەویش یەکلاییکردنەوەی بڕیارە لەنێوان دروستکراوەکان کاتێك کەئاسمان شەق شەق دەبێت بەهۆی هەورێکیەوە ، بۆیە هۆکارەکەی یەکە وە کاتەکەشی یەکە .

2_ بەڵگەی دووەم: ئەو فەرموودەی موسلیم ڕیوایەتی کردووە لەفەرموودەی أبي هريرة بە مەرفوعی کە فەرموودەیەکی قودسیە [69] : ( ئەگەر بەندەکەم یەك بست لێم نزیك

(69) رواه مسلم في صحيحه 2061/4 (ح2675) .

ببێتەوە ئەوا من یەك باڵ لێی نزیك دەبمەوە ، تاوەكو فەرمووی: ئەگەر یەك باڵ لەمن نزیك بێتەوە ئەوا خێراتر دێمە لای )، ئەوەوی گوتوویەتی: ئەوە بەو شێیوەیەیە لەزۆربەی نوسخەكاندا ، وە شایەدیش ئەوەیە كە وتەكەی ( **جئته أتيته** ) ـە .

3ـ لەواتای زمانەوانیدا ( اللغة ): واتای ( أتى ) بەواتای ( جاء ) دێت لەزمانەوانیدا ، الله تعالى ـش زاناترە .

4ـ بنەمایەكی هەندێك لە سەلەف ئەوەیە كە پەیوەندیدار جیاواز بوو ئەوا دەبنە دوو صیفەت ، وەك صیفەتی ( **الرحمن والرحیم** ) كە كردوویانە بە دوو صیفەت چونكە پەیوەست بوونەكەیان جیاوازە ، ئێمەش ڕێك ئەو قسەیە دەكەین وەك ڕۆشتنێك و قیاسێك لەسەر ئەوە .

## صیفەتی شەشەم: صیفەتی ڕازیبوون

**نوسەر فەرموویەتی:** وە وتەی الله تعالى: ( **رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ** )

## ڕوونکردنەوە :

نوسەر پشتی بەیەك ئایەت بەستووە ئەویشیان وتەی الله تعالى یە: ( **رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ** ) [70] .

**پرسێك: مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە لەبارەی ئەو صیفەتە :**

ئەهلی سوننە و جەماعە ئەو صیفەتە بۆ الله تعالى جێگیر دەکەن ، جا هەرکاتێك ویستی لێبێت ڕازی دەبێت .

**مەزهەبی پەکخەران ( المعطلة ) :**

بەڵام پەکخەران بەهەموو جۆرەکانیانەوە ئینکاری دەکەن لەصیفەتی ڕازی بوون بۆ الله ، وە تەفسیری دەکەن بەچەندین تەفسیر ، یاخود بە واتای پاداشت ، وە واتای الله ڕازی بووە لێیان واتە: پاداشتی داونەتەوە ، وە هەندێك جار تەفسیری دەکەن بە واتای ستایش کردن ، الله ڕازی بووە لێیان واتە: ستایشی کردوون ، ئەمانەش هەمووی لادانە لە صیفەتەکانی الله .

وە ڕەدیان دەدرێتەوە: بەوەی پاداشت و ستایش لەبەرووبومی ڕازی بوونە ، وە ئەنجام و بەرووبومی ڕازی بوون ، وە هەمان ڕازیبوونەکە نییە ، جیاوازی هەیە لەنێوان صیفەتەکە و بەرووبومەکانی .

(70) سورة المائدة: 119 .

## صیفەتی حەوتەم: صیفەتی خۆشویستن

**نوسەر فەرموویەتی**: وە وتەی الله تعالی: ( **يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ** )

## ڕوونکردنەوە :

نوسەر پشتی بەستووە بەیەك ئایەت ، ئەویش وتەی الله: ( **يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ** ) [71] .

**پرسێك**: سەلەف صیفەتی خۆشەویستن جێگیردەکەن بۆ الله تعالی ئەویش لەو صیفەتانەیە کە پەیوەستە بەویستنی الله ، ئەوەی خۆشدەوێت کە ویستی لەسەرە و ئەو کاتەش کە بیەوێت .

**پرسێك: مەزهەبی پەکخەران ( المعطلة ) لەبارەی ئەو صیفەتە :**

پەکخەران بەهەموو جۆرەکانیانەوە ئینکاری لەو صیفەتە دەکەن ، چونکە جێگیرکردنی دەبێتە هۆی بڕیاردانی لاشە ( بەپێی ڕای ئەوان )، وە بەدروست دانانی ڕووداوەکانە بۆ الله تعالی ، وە تەفسیری خۆشویستن دەکەن بەپاداشتکردن و پاداشت و سەرخستن و یارمەتیدان ، وە بنەماکەشیان ئەوەیە کە تەفسیری خۆشویستن دەکەن بە بەرووبومەکانی .

وە ڕەتدانەوەشیان وەك پێشووە کە لە صیفەتی ڕازی بوون وەڵامم دایەوە .

(71) سورة المائدة: 54 .

**صیفەتی هەشتەم و نۆیەم و دەیەم: صیفەتی تۆڕەبوون و ڕقلێبوونەوە و پێناخۆشبوون .**

**نوسەر فەرموویەتی :**

وە وتەی الله دەربارەی کافران: ( **غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ** ) وە وتەی: ( **اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ** ) وە وتەی: ( **كَرِهَ اللَّهُ انبِعَاثَهُمْ** )

**ڕوونکردنەوە :**

ئەوەشیان سێ صیفەتە ئەهلی سوننە و جەماعە جێگیریان کردووە :

بەڵام بەڵگەی صیفەتی تۆڕەبوون: وتەی الله: ( **غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ** ) [72] .

وە بەڵگەی صیفەتی ڕقلێبوونەوە: وتەی الله: ( **اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ** ) [73] .

وە صیفەتی پێناخۆشبوون: وتەی الله: ( **كَرِهَ اللَّهُ انبِعَاثَهُمْ** ) [74] .

ئەوەشیان ئەو سێ صیفەتەیە لەو صیفەتانەی کە پەیوەستە بە ویست و ئارەزووەوە ، هەرکاتێك ویستی لێبێت تورە دەبێت وە ڕقی لێدەبێتەوە وە پێی ناخۆش دەبێت .

**پرسێك: ئایە ئەوانە یەك صیفەتن یان سێ صیفەتن ؟**

ئەوانە سێ صیفەتن ، ئەویشیان ڕووکەشی ئەوەیە کە سەلەف بۆی چون کە سێ صیفەتن ، چونکە پەیوەستبوونەکەیان جیاوازە و ئایەتەکانیشیان جیاوازە وە هۆکارەکانیشیان جیاوازە ، بۆ نموونە: پێناخۆشبوون هاتووە لەشێوەی باسی دووڕوان ، وە ڕقلێبوونەوە لەسەر شێوەیەك کە بۆ کافرانە ، وە تۆڕەبوونیش هەندێکجار تۆڕەبوونەکە بۆ کافرانە ، وە لەهەندێك بەڵگە و دەقەوە دەچێت بۆ تۆڕەبوون لەسەر تاوانبارانی تەنها الله پەرستان ، جا کە پەیوەستبوونەکەیان جیاواز بوو ئەوە صیفەتەکانی وەك الرحمن والرحیم ، دەبنە دوو صیفەت ، چونکە پەیوەست بوونەکەیان جیاوازە ، ( الرحمان )

(72) سورة الممتحنة: 13 .

(73) سورة محمد: 28 .

(74) سورة التوبة: 46 .

گشتییە بۆ هەموو دروستکراوەکان ، وە ( الرحيم ) تایبەتە بە ئیمانداران ، ئەوەیان لەسەر یەکێك لە بۆچوونەکانی سەلەف لە پیوەست بوونی دوو صیفەت بەیەکەوە .

**مەزهەبی پەکخەران لەو لەبارەی ئەو سێ صیفەتە :**

بریتییە لە ئینکاریکردن و پەکخستنی ، وە تەفسیری ئەو صیفەتانە دەکەن بەبەروبوومەکانی وە داواکارییەکانی ، بۆیە دەڵێن الله لێیان تۆڕەبوو واتە: سزای دان یاخود تەفسیری دەکەن بە تۆڵەکردنەوە و ڕێنیشان نەدان و سەر زەنشت کردن و سەرنەخستن ، بۆیە وتەی: ( **كَرِهَ اللَّهُ انبِعَاثَهُمْ** ) [75] واتە: ڕێنیشاندەریان نەبوو .

(75) سورة التوبة: 46 .

## صیفەتی یازدەهەم: صیفەتی دابەزین

**نوسەر فەرموویەتی:** وە لە سوننەت دا وتەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) :
**(پەروەردگارمان هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا )**

### ڕوونكردنەوە :

نوسەر بۆ ئەو مەبەستە باسی بەڵگەیەكی كردووە لە سوننەتدا : ( پەروەردگارمان دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا ) [76] فەرموودەكە .

**پرسێك: مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە لەبارەی صیفەتی دابەزین :**
ئەوان دابەزین بۆ الله لەهەموو شەوێكدا بۆ ئاسمانی دوونیا جێگیر دەكەن ، ئەو صیفەتەش لەو صیفەتەكانەیە كە پەیوەستە بە ویست و ئارەزووی الله تعالى وە .

**پرسێك: مەزهەبی پەكخەران لەبارەی ئەو صیفەتە :**

**1_ مەزهەبی جەهمیەكان و موعتەزیلەكان و دوایینەكانی ئەشعەریەكان و ماتوریدییەكان** : ئەوانە تێكڕایان ئینكاری لەصیفەتی دابەزین دەكەن ، وە تەفسیری دابەزین دەكەن یان بەدابەزینی فەرمانەكەی یاخود دابەزینی مەلائیكەتەكانی و بەزەییەكەی .

**2_ مەزهەبی كەللابیەكان:** ئەوانە دابەزین بۆ الله جێگیردەكەن ، وە دڵێن: دابەزین صیفەتێكە لەصیفەتەكانی الله ، بەڵام كاتێك كەتەفسیری ئەو صیفەتە دەكەن بەتەفسیرێك تەفسیری دەكەن كە بەڵگەیە بۆ ئەوەی دروستكراو بێت ، دەڵێن: واتای الله دادەبەزێت واتە: كارێكە الله ئەنجامی ئەدات لە ئاسمانی دونیا ناوی بردووە بە دابەزین ، وە واتای ئەوەی ئەو كارە بكات ، واتە: شتێكی دروستكراو .
بۆیە قسەكەیان ڕێك وەك قسەی جەهمیەكانە ، ئەوە نەبێت كە دەربڕینەكەیان سوكترە یاخود داپۆشراوە بە بەرگێك كە بینەری وتەكانیان هەڵدەخەڵەتێنن ، جا ئەگەر گوتیان

(76) پێشتر باسكراوە .

له صیفەتە کردارییەکانی الله یە ، گومانبەر وا گومان دەبات کە ئەوانە صیفەتەکە جێگیر دەکەن وەك سەلەف ، بەڵام ئەگەر گوتیان کارێکە الله لە ئاسمان دەیکات ، ئەوا ئاشکرا ئەبن ، چونکە بە دروستکراوی دادەنێن ، یاخود شتێکی بەکارهاتوو ، وە هەریەکە لەبەیهەقی لە الأسماء وصفات و ابو الحسن الأشعری و باقلانی لەسەر ئەو مەزهەبەن وە بەهەمان شێوە ابن کلابی ئیمامیان .

**چەند پرسێك لە صیفەتی دابەزین بۆ الله تعالی :**

1_ ئایا دەگوترێت: الله دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا بەبێ جولە و بەبێ شوێن گۆڕین ؟
**وەلام:** نەفی کردنی جولە و شوێن گۆڕین یاخود جێگیرکردنیان پێویستی بەبەڵگەیە بۆیە بێدەنگی هەڵدەبژێردرێت لەسەر ئەوە وە وا دەگوترێت وەك چۆن گوتراوە الله دادەبەزێت وە لەو شوێنە دەوەستین کە سەلەف لێیەوە وەستاون ئەوان لە زۆری زانستەوە وەستاون وە جولە و شوێن گۆڕین جێگیری ناکەین و ڕەتیشی ناکەینەوە ، ئەوە نەبێت کە هەندێك لەسەلەف لە باسی دابەزین باسی جولە و شوێن گۆڕینی کردووە لەلایەنی ڕەتدانەوە کاتێك ڕەدی کەللابیەکانیان دایەوە .

2_ پەککەران گومانیان دروست کردووە سەبارەت بەصیفەتی دابەزین وە گوتیان: الله دادەبەزێت لەسێیەکی کۆتایی لە شەودا جا پێویستە الله بە بەردەوام دابەزێتبێت چونکە هەموو شوێنێك شەوی هەیە ؟
**وەلامیش:** دەگوترێت: هیچ شتێك لەو ناچێت ، وەك چۆن گوێی لەدەنگەکان دەبێت و دەنگێکی لەگەڵ دەنگێکی تر سەر قاڵی ناکات وە ناگوترێت ئەگەر گوێی لەو دەنگە دەبێت دەنگێکی تر سەرقاڵی دەکات ، وە ناگوترێت بەهۆی زۆری دەنگەکان پێویستە الله بەردەوام تەنها بەس گوێبگرێت .

نمونەیەکی تر: لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەی چونکە الله لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵکی دەکات بەیەك کاتژمێر و لێپرسینەوەیەك سەرقاڵی ناکات لە لێپرسینەوەیەکی تر ، وە وەك چۆن ڕزقی هەموو خەڵکی ئەدات بەیەك کاتژمێر ، وە دەژیێنێت و دەمرێنێت و

هیچ کارێك سەرقاڵی ناکات لە کارێکی تر ، چونکە الله هیچ شتێك هاوشێوەی نییە ، بەڵکو ئەوە ئەو دروستکراوە لاوازەیە کە ئەگەر قسە بکات یاخود سەرقاڵ بێت بەکردەوەیەك ئاگای لە شتەکانی تر نامێنێت یاخود ئەگەر دابەزی لەشوێنێك ناتوانێت لە شوێنێکی تر دابەزێت لەهەمان کات دا [77] .

(77) ومن أراد مزيد الرد ففي كتاب ابن تيمية واسمه شرح أحاديث النزول ص 68 ، 106 ، ورسالة ابن رجب في فضل علم السلف ص 6 ، وشرح الهراس لكتاب التوحيد لابن خزيمة لما ذكر صفة النزول لله تعالى .

## صیفەتی دوازدەم: صیفەتی سەرسوڕمان بۆ الله

**نوسەر فەرموویەتی:** وە وتەی: ( **پەروەردگارت سەرسام بوو بەگەنجێك کە ویست و ئارەزووی بۆ لای ڕابواردن نەبوو** )

**ڕوونکردنەوە :**

**مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە** جێگیر کردنی ئەم صیفەتەیە بۆ الله بەوەی بۆی شایستە و شایەنییەتی ، وە نووسەر پشتی بەستووە بەفەرموودەیەك بۆ جێگیرکردنی صیفەتی سەرسوڕمان بۆ الله تعالی ، ئەویش ئەو وتەی پێغەمبەرە ( صلی الله علیه وسلم ) : ( پەروەردگارت سەرسام بوو بەگەنجێك کە ویست و ئارەزووی بۆ لای ڕابواردن نەبوو ) [78] .

**مەزهەبی ئەهلی کەلام دەربارەی صیفەتی سەرسوڕمان** ئەوەیە کەوا هەموویان بەبێ جیاوازی نەفی ئەم صیفەتە دەکەن بۆ الله تعالی ، وە تەفسیری دەکەن بەپاداشت و بەخشش و تەوفیق بوون ، هەموو تاقمە پەکخەرەکان نەفی ئەم صیفەتە دەکەن لەجەهمییەکان و موعتەزیلەکان و ئەشاعیرەکان و ماتوریدییەکان .

**وە لەهەندێك لەسەلەف هاتووە** کەوا جێگیری ئەم صیفەتەیان نەکردووە بۆ الله تعالی وەکو شریح چونکە باوەڕی وابووە الله سەرسام نابێت چونکە سەرسام بوون بەهۆی نەزانینی هۆکارە و الله ش دوورە لەنەزانین (الفتاوی 20/33)، بەلام بۆ هەموو سوارچاکێك کەوتنێك هەیە .

(78) رواه أحمد في مسنده 151/4 (ح 17409).

**صیفەتی سێزدەم: صیفەتی پێکەنین بۆ الله تعالى**
**نووسەر فەرموویەتی:** وە وتەی: ( **الله پێکەنینی هات بەدوو پیاو کە بەشەڕ هاتن یەکێکیان ئەویتری کوشت دواتر هەردووکیان چوونە بەهەشتەوە** )

( کوژراوەکە چووە بەهەشتەوە چونکە موسلمان بوو ، وە بکوژەکەش دوای ئەوە بەرەحمی الله هیدایەتی وەرگرت و بووە موسلمان بۆیە ئەویش چووە بەهەشتەوە ) (وەرگێڕ ) .

**ڕوونکردنەوە :**

**مەزهەبی پەکخەران دەربارەی صیفەتی پێکەنین :**
هەموو پەکخەران نەفی ئەم صیفەتە دەکەن و تەفسیری دەکەن بەڕەزامەندبوون ، دواتر نووسەر سەرنجی تەواوی داوە لەباسکردنی مەزهەبی سەلەف دەربارەی ئەم صیفەتە .

**پرسێك :**
لەناو ئەهلی سوننەدا هەیە تەئویلی صیفەتی پێکەنین دەکات بۆ الله وەکو ابن عبدالبر ، چونکە ئەو ئەم صیفەتە جێگر ناکات بۆ الله بەلکۆ تەئویلی دەکات ، وە تەئویل کردنیشی بۆ ئەم صیفەتە دەری ناکات لەئەهلی سوننە و جەماعە ، چونکە قاعیدەیەکمان هەیە دەڵێت: ئەوەی موافقەی ئەهلی سوننە و جەماعە بکات لەمەنهەج و لەبنچینەکانی دین وە بینرا کە صیفەتەکانی جێگیر دەکرد بۆ الله ، وە جێگیری ئەو صیفەتانەی دەکرد کە الله بۆ خۆی جێگیری کردوون بەلام ئەگەر تێکەوت و لایدا لەصیفەتێك یان دووان وە تەئویلیانی دەکرد بەلام بۆ هەموو سوارچاکێك کەوتنێك هەیە ، بەلام هەر لەئەهلی سوننە و جەماعە دەمێنێتەوە .

**بەشێك**

دوای ئەمە نووسەر مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە تەواو دەكات لەبابەتی صیفەتەكان

**نوسەر فەرموویەتی :**

ئەمە و ئەوەی وەكو ئەو كە سەنەدەكەی صحیح بێت و ڕیوایەتكارانی دادپەروەربن باوەڕمان پێیەتی و ڕەتی ناكەینەوە و نكۆڵی لێ ناكەین و تەئویلی ناكەین بەتەئویلێك كە مخالفی ڕووكەشەكەی ( ظاهر ) ی بێت وە نایچوێنین بەصیفەتەكانی دروستكراوەكان وە نایچوێنین بەتایبەتمەندییەكانی داهێنەرەكان وە دەزانین كە الله تعالى هاوشێوەی نییە وە نموونەیشی نییە ( **لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ** ) وە هەموو ئەوەی كە خەیالی بۆ دەڕوات لەذهنی مرۆڤدا یانیش ئەوەی بەسەر دڵەكاندا دێت الله تعالى پێچەوانەیەتی .

لەوتەكەی نووسەردا چەند شتێك تێبینی دەكرێن ، ڕەچاوی چەند بنچینەیەك دەكرێن سەبارەت بەناوەكان و صیفەتەكانی الله ( الأسماء والصفات ) ، باسی ئەمانەی دێن :

**1ـ باوەڕبوون بەناو و صیفاتەكان ( الأسماء والصفات ) .**

**2ـ ئینكاریكردنی ڕەتكردنەوە كە دژی ڕازیبوون پێی و ملكەچ بوونە ، وە ئینكاریكردنی نكۆڵیكردن ، وە لەوانەش بەدرۆخستنەوە كە دژی دانپیانان و بەڕاستدانانە** ، وە نەفی كردنی تەئویل و دیاریكردنی نەفیكردنی تەئویل ، بەتەئویلێك دژ و پێچەوانەی ڕووكەشی دەق و شێوازەكەی ، وە نەفی كردنی وێكچواندن كە دژی تەوحیدە ، دواتر نووسەر بۆ ئەم بنچینانە پشتی بەستووە بەو دارشتنەی كە بەوتەی الله تعالى دارێژراوە: ( **لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ** )[79] .

دواتر دوای ئەمە نووسەر گەڕاوەتەوە بۆ جێگیركردنی چەند صیفەتێكی تر بۆ الله تعالى ، بێگۆمان ئەو صیفەتانەی كەوا لەسەریان دەدوێین زۆر گرنگن ، وە بەركەوتنەكانی واقعی دانەر وایكرد ئەم صیفەتانە لەگرنگترینی صیفاتەكانبن كەوا قسە و باس و

(79) سورة الشورى: 11 .

ڕووبەڕووبوونەوەی زۆری تێدابوو لەگەل ئەهلی کەلام بەتایبەتی لەگەڵ ئەشعەرییەکان ، بۆیە تێبینی دەکرێت لەو صیفەتانەی کە باسی کردوون دوورو درێژبووە لەبەلگەهێناوە ، وە زۆر ئایەت و فەرموودەی هێناوەتەوە کەوا جێگیریانی دەکەن ئەمەش بەلگەی ئەوەیە کەوا نووسەر ڕووبەڕووی ململانێیەکی فیکری بووەتەوە لەگەل موبتەدیعەکانی سەردەمی خۆی لەئەهلی کەلام ، وە بەتایبەتیش لەگەل ئەشعەرییەکان .

**وە ئەو صیفەتانەی کە نووسەر تیایاندا دوور و درێژبووە لەباسکرنیاندا شەش صیفەتن :**

1_ صیفەتی الإستواء (بریتییە لەو بەرزبوونەوەیەی کە کردارییە و پەیوەستە بەویستی الله تعالی ) .

2_ صیفەتی العلو ( بەرزییەتی ) بۆ الله تعالی ( بریتیە لەو بەرزبوونەوەیەی کە پێویستە بۆ الله تعالی و نابێت نەبێت و صیفاتێکی ذاتییە ) .

3_ صیفەتی قسەکردن ( الكلام ) بۆ الله تعالی .

4_ ئەوەی پەیوەستە بە قورئانەوە .

5_ صیفەتی بینینی الله تعالی لەلایەن ئیماندارانەوە ، کە الله تعالی دەبینرێت لەڕۆژی قیامەتتدا .

6_ صیفەتی ئەوەی کە هەرچییەکی بیەوێت ئەنجامی دەدات .

وە بەم شەش صیفەتانە ئەم بەشەی کۆتایی پێهێناوە کە پەیوەستن بەمەزهەبی سەلەفەوە لەبابەتی ناو و صیفاتەکان ( الأسماء والصفات ) ، وە ئەم صیفەتانە گفتوگۆ دەکەین بەو ڕیزبەندییەی نووسەر ئەگەر الله ویستی لەسەر بێت .

## صیفەتی چواردەم
## الإستواء ( بەرزبوونەوە لەسەر عەرش ) : ( ئەمەش پاشکۆی ڕێزبەندیەکەی پێشووە )

### نووسەر فەرموویەتی :

وە لەمەش وتەی الله تعالى: ( **الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى** )...... تاوەکو وتی: وە باسی ئەم هەواڵەی کرد تا وتەی ( وە لەسەرووی ئەم عەرشە ، الله لەسەرووی ئەم عەرشەیە ) ئەمە و ئەوەی هاوشێوەیانە لەوەی کە سەلەف کودەنگ بوون لەسەری بەگواستنەوەی وە ڕازیبوون پێی و بەگژیدانەچوونەوە نەبەڕەتکردنەوەی وە نە بەتەئویل کردنی وە نەبەوێکچواندنی وە نە بەنموونەبۆهێنانەوە بۆی .

پرسیاریان کرد لە مالیکی کوڕی ئەنەس پێیان ووت ئەی باوکی عبدالله ( **الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى** ) لێرەدا ( استوی ـ بەرزبوونەوە ) چۆنە ؟ فەرمووی: بەرزبوونەوە شاراوە نییە ( واتە ڕوون و ئاشکرایە ) وە چۆنیەتییەکەی غیر معقولە ( واتە عەقل درکی پێ ناکات ) وە باوەڕهێنان پێی واجبە و پرسیارکردن دەربارەی بیدعەیە ، دواتر فەرمانی بەپیاوەکە کرد و لەوێ دەریانکرد .

### ڕوونکردنەوە :

**پرسی یەکەم: واتای إستواء ( بەرزبوونەوە لەسەر عەرش ) :**

إستواء لەزماندا ( زمانەوانیدا ) : بەواتای العلو ( بەرزییەتی ) و جێگیری و مەبەست و بڵندبوون دێت .

لەشەرعدا: بەواتای العلو الله ( بەرزییەتی الله ) و جێگیربوونی دێت لەسەر عەرش ، وە ئەهلی سوننە و جەماعە صیفەتی إستواء بۆ الله تعالى جێگیردەکەن لەسەر عەرشەکەی بەم واتایانە: بەرزبوو و جێگیربوو و بڵندبوو وە هەندێکیان دانیشتن ( قعد و جلس ) بۆ زیاد دەکەن .

**پرسی دووەم: واتای عەرش :**
عەرش بەواتای شوێنی دانیشتنی پاشا دێت .
بەڵام لەشەرعدا: بریتیە لەدروستکراوێکی گەورە کە الله تعالی دروستی کردووە و لەسەری بەرزبوەتەوە و سەقفی جیهانە و چەندین ڕاگری هەیە .

**پرسی سێیەم: مەزهەبی خەلکی دەربارەی إستواء لەسەر عەرش ( بەرزبوونەوەی الله لەسەر عەرش ) :**
مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە بەم شێوەیەبوو کەوا ڕۆیشت و باسکرا ، بەلام پەکخەران هەموویان جگە کەللابییەکان و ئەشعەرییە یەکەمەکان نەبن ئەوانی تر هەموویان نەفی ئەم صیفەتە دەکەن بۆ الله و جێگیری ناکەن ، ئەوانیش جەهمییەکان و موعتەزیلەکان و دواینەکانی ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکانن ، کە نەفی صیفەتی استواء دەکەن لەسەر عەرش بۆ الله تعالی ، وە دەلێن: استوی بەواتای استولی (دەستگرتن) دێت ، وە تەفسیری عەرش دەکەن بەمولك ، واتە دەستی گرت بەسەر مولکدا .
مەزهەبی کەللابییەکان و ئەشعەرییە یەکەمەکان وەکو أبي الحسن الأشعري و الباقلاني و بەشێك لەوانەی پێیانەوە کاریگەربوون وەکو بەیهەقی ، ئەمانە ئەوە جێگیردەکەن کە الله لەسەر عەرش بەرزبووەتەوە بەلام تەفسیری دەکەن بەتەفسیرێك کە لەبینەری دەشارنەوە ، بینەر گومان دەبات کە ئەوان موافقی ئەهلی سوننە و جەماعە دەکەن وە بەم شێوەیە تەفسیری دەکەن :
**دەلێن**: الله تعالی بەرزبووە لەسەر عەرش بریتییە لەصیفەتێك لەصیفەتەکانی الله تعالی ، کە صیفەتێکی کردارییە بۆ الله وە واتای ئەوەی کە صیفاتێکی کردارییە واتە کارێکی ئەنجامدا لەسەر عەرش ناویاننا استواء .

وە ئەو کەسەی ئەم وتەیان دەبینێت دەلێت: ئەمە مەزهەبی سەلەفە ، بەلام مەبەستیان لەکار واتە بەکارهاتوو واتە ئەم کارە کەوا الله ئەنجامیداوە لەسەر عەرش دروستکراوە

ڕوون و بەلگەنەویستە لەذاتی خۆیەوە ، بەمەش دەرکەوت کەوا تەئویلی ئەم صیفەتە دەکەن چونکە بەصیفەتێکی کرداری پەیوەست بەویستی الله دانانێن ، بەڵکۆ لە بابی بەکارهاتوو ( مفعول ) دایدەنێن ، وە نموونەی صیفەتی ( استواء ) بەتەواوەتی وە لەسەر مەنهەجی ئەوان لەصیفەتی دابەزین ، ئەوان دەلێن دابەزین صیفەتێکە لەصیفەتە کردارییەکانی الله تعالى بەو واتایەی کەوا الله کارێکی ئەنجامدا لە ئاسمان ، واتە شتێکی دروستکرد لەئاسمان و ناویاننا دابەزین .
ئەمەش وتەی البیهقی و ابن فورك ـە وە بریتیە لەمەزهەبی کەللابییەکان لەصیفەتە ئارەزوومەندییەکانی الله کەوا پەیوەستە بەویستەوە .

**پرسێك: ئایا دەوترێت: کاتێك کە کەوا الله لەسەر عەرشە ئایا بەر عەرش دەکەوێت یاخود نا ؟**

وەلام: نموونەی ئەم جۆرە دەستەواژانە سەلەف لێی بێدەنگ بوونە و قسەیان دەربارەیان نەکردووە نە بەنەفی کردن وە نەبەجێگیرکردن بەهۆی نەهاتنی بەلگەوە دەربارەیانەوە .
قاعیدەیەك: صیفەتەکانی الله تەوقیفین قسەیان دەربارەیان ناکرێت چ بەنەفیکردن یانیش بەجێگیرکردن تەنها بەبەڵگە نەبێت ، وە هەندێك لەزانایان بۆ نەفی کردن چوون ، دەلێن : الله لەسەر عەرشە بەبێ ئەوەی بەری بکەوێت ، وە ئەم وتەیەش لاوازە ، وە هەندێك لەسەلەفی صالح ئەنجامیانداوە لەبابی ( لەبابەتی ) وەڵامدانەوەی گرۆپە گۆمڕاکانی تر .

**پرسێك: ئایا کاتێك الله دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا عەرش چۆل دەبێت یاخود نا ؟**

ئەم پرسە وەکو ئەوەی پێش خۆیەتی ، دەوترێت: الله دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا وە دەوترێت الله لەسەر عەرشەکەیەتی وە بێدەنگبوون لەبابەتی چۆڵبوونی عەرش ، وە هەندێك لەئەهلی حەدیس بۆ ئەوە چوون بەلام کەمن ، لەوانەیان ابن مندە ، وە دەلێت: کاتێك الله دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا عەرش لێی چۆل دەبێت ، وە ئەمەش

لەکەموکورتییەکانی ابن مندە یە ، وە قاعیدەیەك هەیە کە لەو شوێنە بوەستین کە پێشینانمان لێی وەستاون چونکە ئەوان لەسەر عیلم وەستابوون و دەڕۆیشتن .

## صيفەتی پازدەم: صیفەتی العلو

### نوسەر فەرموویەتی :

وە وتـــەی الله تعـالی: ( **أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ** ) وە وتــەی پێغـەمبـەر (صلی الله علیـە وسلم) : ( پەروەردگارمان الله کە لەئاسمانە ناوی تۆی پیرۆزکردووە ) وە کاتێك پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) بەکەنیزەکەی ووت: ( **الله لەکوێیە ؟** ) کەنیزەکەش وتی: الله لەئاسمانە ، پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) بەسەحابەکەی فەرموو: ( **ئازادی بکە چونکە باوەڕدارە** ) مالیکی کوڕی ئەنەس و موسلیم و جگە لەوانیش ڕیوایەتیان کردووە لەپێشەواکان ، وە پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) بە الحصین ـی فەرموو: ( **چەند خوا دەپەرستیت** ؟ ) ئەویش فەرمووی: حەوت خوا دەپەرستم شەشیان لەزەوین و یەکێکیان لەئاسمانە ، پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) پێی فەرموو: ( **دەگەڕێیتەوە بۆ لای کێ لەکاتی تکا کردن بۆ لابردنی ئەو ناخۆشیانەی بەسەرتدا دێن و لەکاتی ترسدا** ؟ ) فەرمووی: ئەو خوایەی کە لەئاسمانە ، پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) پێی فەرموو : ( **واز لەو شەش خوایەی سەر زەوی بهێنە و ئەو خوایە بپەرستە کە لەئاسمانە وە من فێری دوو پاڕانەوەت دەکەم** ) ، ئەویش موسلمان بو و پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) فێری کرد کەوا بلێت: ( **خوایە هیدایەت و سەرکەوتووم بکە بۆ ڕێگای ڕاست و حەق و بمپارێزە و دوورم بخەرەوە لەخراپەی نەفسم** ) .

وە گواستراوەتەوە لەکتابە پێشین و یەکەمەکان دەبارەی نیشانەکانی پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) و هاوەڵانی کە ئەوان لەسەر زەوی سەجدە دەبەن و بانگەشەی ئەوە دەکەن خوایان لەئاسمانە .

وە ابـو داود گێڕاویـەتیـەوە لـە سـوننەنـەکـەیدا کـەوا پێغـەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) فەرموویەتی: ( **لەنێوان ئاسماندا مەودایەك هەیە وایە و وایە** ) ، وە باسی ئەم هەواڵەی کرد تا وتەی ( **وە لەسەرووی ئەم عەرشە ، الله لەسەرووی ئەم عەرشەیە** ) ئەمە و ئەوەی هاوشێوەیان لەوەی کە سەلەف کۆدەنگ بوون لەسەری بەگواستنەوەی و ڕازیبوون پێی

وە بەگژیدانەچوونەوە نەبەڕەتکردنەوەی وە نە بەتەئویل کردنی وە نە بەوێکچواندنی وە نە بە نموونە بۆهێنانەوەی .
پرسیاریان کرد لە ئەنەسی کوڕی مالیك و پێیـان ووت: ئەی باوکی عبداللە ( **الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى** ) لێرەدا ( استوی ـ بەرزبوونەوە ) چۆنە ؟ فەرمــووی: بەرزبوونەوە شاراوە نییە ( واتـە ڕوون و ئاشکرایە ) وە چۆنیـەتییەکەی غیـر معقولـە ( واتـە عـەقل درکی پێ ناکـات ) وە بـاوەڕهێنـان پێی واجبە و پرسـیارکردن دەربـارەی بیدعـەیە ، دواتر فـەرمانی بەپیاوەکە کرد و لەوێ دەریان کرد .

## ڕوونکردنەوە :

**پرسی یەکەم :**
تێبینـی دەکرێـت نووسـەر دوور و درێژبـووە لـەصـیفەتـی العلـو وە پشـتی بـەزۆر بـەلگـە بەستووە ، پشتی بەسـتـووە بەیەك ئایەت دواتر بەچـوار فەرمووده ، وە پشـتـی بەستووە بەدەقێکی تر کە وتەی ئیمامی مالیکە ، لەهەمانکاتدا لەصیفەتەکانی پێش ئەم صیفەتە وا دوور و درێژنــەبــووە تێیــدا و زۆر بــەلگــەی تێــدا نــەهێنــاوەتــەوە ، هۆکــاری ئــەم زۆر بەلگەهێنانەوە لەم صیفەتەدا ـ اللە ـش زاناترە ـ بۆئەوەیە بابەتی صیفەتی العلو لەزۆرترین ئەو بابەتانەبوو کەوا چەندین ململانێی ڕووبەڕووبوونەوە تێیدا ڕوویداوە لەنێوان ئەهلی سـوننە و ئـەشـعەرییـەکـان وە نووسـەر لـەسـەردەمـی بلاوبوونـەوە و گـەشـەکردنـی ئەشعەرییەکان ژیاوە ، دواتر زیاتر لەبەلگەیەکی هێناوەتەوە بۆ جێگیرکردنی ئەم صیفەتە گەورەیە .

**پرسی دووەم: مەزهەبی سەلەف سەبارەت بەبابەتی صیفەتی العلو :**
مەزهەبیان جێگیرکردنی صیفەتی العلو یە بۆ اللە بــەوەی شیاو و شایەنییەتی جـا علو الذات ( بەرزییەتی ذات ) یان علو القدر ( بەرزییەتی توانا ) یانیش علو القهر ( بەرزییەتی زاڵبـوون ) بێـت ، ئـەم سێ جـۆرە ( العلـو ) ــە جێگیـرن بـۆ اللە تعـالی ، وە شـوێنی العلـو جێگیر دەکەن بۆ اللە تعالی ، وە بەلگەش لەسەر ئەمە گەلێك زۆرتـرە لەوەی لەچەند

بەڵگەیەکی کەمدا دەوری بدەین ، بەڵکۆ بەلگە لەسەر صیفەتی العلو بریتیە لە قورئان و سوننەت و ئیجماع ( کۆدەنگی ) و ئەقل و فیطرەتی پاك ، تەنانەت گیاندارەکانیش بەرزیەتی ( العلو ) بۆ الله جێگیردەکەن ، ڕوویان و چاویان بەرزدەکەنەوە بۆ ئاسمان ، الصابوني کۆدەنگی سەلەفی نەقل کردووە لەکتابی عەقیدەی ئەهلی حدیث لەسەر جێگیرکردنی صیفەتی العلو بۆ الله تعالی و ئینکاریکەر لەصیفەتی العلو کافرە .

**پرسی سێیەم: مەزهەبی ئەهلی کەلام دەربارەی صیفەتی العلو :**

1_ **مەزهەبی کەللابییەکان و ئەشعەرییە یەکەمەکان وە لەهاوشێوەیان وەکو کەڕامییەکان:** ئەمانە صیفەتی العلو بۆ الله جێگیردەکەن بەهەرسێ جۆرەکەی العلو القدر ( بەرزییەتی توانا ) و العلو القهر ( بەرزییەتی زاڵبوون ) و العلو الذات ( بەرزییەتی ذات ) .

2- **مەزهەبی جەهمییەکان و موعتەزیلەکان و ماتوریدییەکان و دواینەکانی ئەشعەرییەکان** : ئەمانە علو القدر والقهر ( بەرزییەتی توانا و زاڵبوون ) جێگیردەکەن بۆ الله کەوا بەرزە لەتوانای و زاڵبوونی و صیفاتەکانی وە نەفی علو الذات ( بەرزییەتی ذات ) و علو المکان ( بەرزییەتی شوێن ) دەکەن ، جەهمییەکان دەلێن الله لەهەموو شوێنێکە ، بەلام ماتوریدییەکان و ئەشعەرییەکان دەلێن نەلە دەرەوەی جیهانە وە نەلە ناوەوەیتی وە نەپەیوەندی پێیەوە هەیە وە نە لێی جودابووتەوە وە نەلەسەرەوەیەتی وە نە لەخوارەوەیەتی .

**پرسی چوارەم: ئەهلی بیدعە بەچی تەفسیری ئەو ئایەتانە دەکەن کەوا صیفەتی العلو جێگیردەکەن :**

وەڵام: تەفسیری دەکەن بەعلو القدر والقهر والملك ( بەرزییەتی توانا و زاڵبوون و مولك و دەستەڵات )، وە دەربارەی ئەو وتەی الله تعالی: ( **أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ** ) [80] دەلێن :

(80) سورة الملك: 16 .

ئایا ئێوە دڵنیان لەمولك و دەستەلاتەكەی لەئاسمان ، وە ڕەدیان درایەوە بەوەی كەوا مولك و دەسەڵاتی الله لەئاسمانە و لەزەویشە ، بەهەمان شێوە لەو فەرموودەیەی كەوا پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بەكەنیزەكەی فەرموو: الله لەكوێیە ؟ كەنیزەكەش وتی: الله لەئاسمانە ، واتە: مولك و دەسەڵاتەكەی لەئاسمانە ، وە نووسەر كۆتایی هێنا بەفەرموودەكە لەجێگیركردنی صیفەتی العلو ، وە باسی كۆدەنگی سەلەفی كردووە لەسەر جێگیركردنی صیفەتی العلو .

**چەند پرسێك دەربارەی صیفەتی العلو :**

1_ ئایا الجهة ( جێگا ) بۆ الله جێگیر دەكرێت ؟ لەجێگەی العلو ـە ؟
وەڵام: بەلێ بەیەكدەنگی سەلەف .

2_ ئایا پرسیار دەكرێت دەربارەی شوێنی الله ؟ واتە بوترێت: الله لەكوێیە ؟
وەڵام: بەلێ بەكۆدەنگی سەلەف بەهۆی ئەو فەرموودەیەی كەوا پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بەكەنیزەكەی فەرموو: ( الله لەكوێیە ؟ كەنیزەكەش فەرمووی: لەئاسمانە ) .

**پرسێك :**

لەچەندین ئایەت و فەرموودەدا زاراوەی ( في السماء ) هاتووە وەكو وتەی الله تعالى: ( **أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ** ) (81) ، وە بەهەمان شێوە لەفەرموودەی صحيح دا كاتێك پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بەكەنیزەكەی ووت: ( الله لەكوێیە ؟ كەنیزەكەش ووتی: الله لەئاسمانە ) (82) ، ئایا واتای ( في السماء ) چییە ؟
**وەلام:** دیاریكردنی تەفسیری وشەی ( في ) دەوەستێتە سەر ئەوەی مەبەست چییە لەوشەی ئاسمان ( السماء ) ، مەبەست لەوشەی ئاسمان ( السماء ) بەواتای العلو

(81) سورة الملك: 16 .

(82) رواه مسلم في المساجد ومواضيع الصلاة برقم (836) ، والنسائي في السهو برقم (1203) ، وأبو داود في الصلاة برقم (795) .

دێت ، خۆ ئەگەر ( في ) لەم بەشە بێت ئەوا ( في السماء ـ لەئاسمان ) بەواتای ( في العلو ـ لەبەرزییەتی ) دەگەیەنێت .

ئەگەریش مەبەست لەوشەی ئاسمان ( السماء ) حەوت ئاسمانە ناسراوەکان بێت ، ئەوا وشەی ( في ) واتای لەسەر ( علی ) دەگەیەنێت ، بەمەش واتای الله لەسەر ئاسمانەکانە لەسەرووی عەرشەوە ، ئەم دوو واتایانەش صحیح و دروستن ، ئەمەش مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعەیە .

## صیفەتی شازدەهەم: صیفەتی قسەکردن :

### نوسەر فەرموویەتی :

وتەکەی ( لەصیفەتەکانی الله تعالی ، ئەوەیە کە قسەی کردووە بە قسەیەکی کۆن ، ئەو کەسە گوێی لێدەبێت کە الله ئارەزووی لەسەرە لەدروستکراوەکانی ، پێغەمبەر موسی علیە السلام گوێی لێبوو بەبێ هیچ واستەیەك ، وە جوبریلیش گوێی لێبووە ، وە ئەوەشی کە ڕێگای پێداوە لە مەلائیکەتەکانی و پێغەمبەرانی ، وە قسەش دەکات لەگەڵ ئیمانداران لەڕۆژی قیامەتدا ، وە قسەی لەگەڵ دەکەن ، وە ڕێگایان پێ ئەدات و سەردانی دەکەن ، الله تعالی فەرموویەتی: ( **وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا** )[83] ، وە فەرموویەتی: ( **قَالَ يَا مُوسَىٰ إِنِّي اصْطَفَيْتُكَ عَلَى النَّاسِ بِرِسَالَاتِي وَبِكَلَامِي** )[84] ، وە فەرموویەتی: ( **مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللَّهُ** )[85] ، وە فەرموویەتی: ( **وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ** )[86] وە فەرموویەتی: ( **فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ يَا مُوسَىٰ * إِنِّي أَنَا رَبُّكَ** )[87] ، وە فەرموویەتی: ( **إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي** )[88] ، وە دروست نییە هیچ کەسێك ئەوە بڵێت جگە لە الله تعالی نەبێت .

وە عبداللە بن موسعود ( الله لێی ڕازی بێت ) فەرموویەتی: ( ئەگەر الله بەوەحی و نیگاوە قسەبکات ، ئەوا خەڵکی ئاسمان گوێیان لەدەنگی دەبێت ) ، لەپێغەمبەری الله وە گێڕدراووتەوە .

وە عبداللە بن انیس دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری الله ـەوە (صلی الله علیە وسلم ) فەرموویەتی: ( **لەڕۆژی قیامەتدا الله دروستکراوەکان حەشر دەکات بەڕووتی و پێخواسی و**

(83) سورة النساء: 164 .
(84) سورة الأعراف: 144 .
(85) سورة البقرة: 253 .
(86) سورة الشورى: 51 .
(87) سورة طه: 11 _ 12 .
(88) سورة طه: 14 .

**خەتەنە نەكراوی و بانگیان دەكات بەدەنگێك كە ئەوەی لەدوور و نزیكە گوێی لێ دەبێت : من پاشام ، من دادوەرم )** [89] ، امام احمد ریوایەتی كردووە و بوخاریش شایەدی بۆ داوە .

وە لەهەندێ ئەثرەوە: كاتێك كە موسی علیه السلام لەشەودا ئاگری بینی ، سوڕایەوە و ترس دای گرت ، پەروەردگارەكەی بانگی كرد: ئەی موسی ، موسی بەخێرایی وڵامیدایەوە بەدەنگی نەرم و لەسەر خۆوە ، وە گوتی: لبیك ، لبیك ، گوێم لەدەنگتە ، و شوێنت نابینم ، تۆ لەكوێیت ؟ فەرمووی: من لەسەرەوەی تۆم ، ولەپێشەوەتم ، وە لای ڕاست و چەبتم ، جا زانی ئەو صیفەتە نابێت بۆ جگە لە الله نەبێت ، فەرمووی: بەو شێوەیە ئەی پەروەردگارم ، ئایا گوێم لە قسەی تۆ دەبێت یان قسەی نێردراوەكەت ؟ فەرمووی: بەڵكو قسەی من ئەی موسی .

## ڕوونكردنەوە :

**پرسی یەكەم :**

ئەم صیفەتە لەو صیفەتانەیە كە گفتوگۆ و ملمڵانێی لەسەر دروست بووە لەنێوان ئەهلی سوننە و جەماعە و بیدعەچیان ، بەهۆی ئەوەوە نوسەر قسەی زۆری لەسەر كردووە ، وە بەدورودرێژی بەڵگەی لەسەر هێناوەتەوە لە قورئان و سوننەت .

**پرسی دووەم: مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە سەبارەت بە صیفەتی قسەكردن بۆ الله تعالى :**

ئەهلی سوننە و جەماعە قسەكردن بۆ الله تعالى جێگیر دەكەن ، وە لەصیفەتەكانی الله یە ، وە صیفەتێكە لە جۆری ڕووداوی كۆن و تاك تاك دا ، هەر بۆیە نوسەر فەرموویەتی ( قسەی كردووە بە قسەیەكی كۆن ) واتە: كۆنە بەگوێرەی جۆرەكەی ، پەیوەستە بە ویست و ئارەزووی الله بەگوێرەی تاك تاك ، هەركاتێك بیەوێت قسە دەكات وە هەركاتێك بیەوێت قسە ناكات ، وە الله قسە دەكات بە قسەیەك كە گوێی

(89) أحمد 495/3 (ح16085) .

لێدەبێت ، هەر بۆیە نوسەر فەرمووی: ئەو کەسە گوێی لێدەبێت کە خۆی ویستی لەسەرە ، وە لەدروستکراوەکانی کە گوێیان لێبووە موسی علیه السلام گوێی لێبووە بەبێ هیچ واستەیەك ، وە جوبریلیش گوێی لێبووە ، وە ئەوەی خۆی ڕێگای پێداوە لە مەلائیکەت و پێغەمبەرانی .

**پرسی سێیەم: مەزهەبی ئەهلی کەلام :**

1_ **مەزهەبی کەڕامیەکان**: ئەوانەش قسەکردن بۆ الله جێگیر دەکەن ، بە قسەیەك کە گوێی لێدەبێت ، وەك ئەهلی سوننە وە دەڵێن قسەکردنی الله پەیوەستە بە ویست و ئارەزووی خۆی و ئەزەلی نییە .

2_ **مەزهەبی کەللابیەکان**: ئەوانەش قسە بۆ الله جێگیر دەکەن وە صیفەتێکە لەصیفەتەکانی الله بەلام قسەکردنێکی نەفسیە واتە لەنەفسی الله دایە و دەنگی نییە و کەس گوێی لێنابێت ، وە گوتیان: گوێ دەگیرێت لە قسەی الله ی نەفسی وە چیرۆکێکە لە قسەی الله وە دەڵێن قسەکە لەجۆری کۆنە وتاك تاك .

3_ **مەزهەبی ئەشعەریەکان**: بریتییە لە قسەیان ڕێك وەك کەللابیەکانە وەك یەکن ، ئەوە نەبێت کە ئەڵێن: ئەوەی کە گوێی لێ دەبێت لە قسەی الله بریتییە لە عیبارەتێك ( گۆزارشتێك ) دەربارەی قسەی الله .

4_ **مەزهەبی پەکخەران لەجەهمیەکان و موعتەزیلەکان**: بریتییە لە نەفی کردنی قسە لە الله ، قسە ناکات و قسەکردن صیفەتی نییە ، ئەوەشی کە دراوەتە پاڵ الله لە قسە کە هاتووە لە قورئان و سوننەت واتای ئەوەیە کە الله قسەی دروستکردووە ، گوتیان وەك چۆن دەگوترێت الله ڕزقی دروستدەکات بەو شێوەیەوە قسەش دروست دەکات ، وە نوسەر پشتی بەستووە بە شەش ئایەت بۆ جێگیرکردنی صیفەتی قسەکردن وە پشتی بەستووە بە دوو فەرموودە و هەندێك ئەثەر .

**بەشێك**

وە وتەی: ( لە قسەی الله تعالى بریتییە لەقورئانی پیرۆز ، ئەویش پەرتووكە ڕوونەكەی الله یە ، وە پەتە بەهێزەكەیەتی ، وە ڕێگا ڕاستەكەیەتی ، وە دابەزێنراوی الله تعالى یە ، فریشتەی وەحی دایبەزاندووە ، بۆ سەر دڵی گەورەی پێغەمبەران بەزمانێكی ڕوونی عەرەبی ، دابەزێنراوە و دروستكراو نییە ، هەر لەوەوە هاتووە بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە ، ئەوانیش سورەتی موحكەمن و ئایاتی ڕوون ، وە پیت و وشەن .

ئەوەی بیخوێنێتەوە و بۆ هەر پیتێك دە ( 10 ) چاكەی بۆ هەیە ، یەكەم و كۆتایی بۆ هەیە ، وە پاداشتی و دوو ئەوەندە ، دەگوترێتەوە لەسەر زوبانەكان ، پارێزراوە لەسینگەكان ، وە گوێ لێگیراوە لە گوێیەكان ، نوسراوەتەوە لەموصحەفەكاندا ، موحكم وە متشابهی تیایە ، وە نەسخكراو و نەسخكەرەوە ، وە گشتی و تایبەت ، وە فەرمان و ڕێگری: ( **لَّا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ** ) [90] ، وە وتەی الله تعالى : ( **قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا** ) [91] ، ئەوەش ئەو كتێبە عەرەبییەیە كە ئەوانەی كافربوون پێی گوتیان: ( **لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا الْقُرْآنِ** ) [92] وە هەندێكی تریان گوتیان: ( **إِنْ هَٰذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ** ) [93] ، الله سبحانه وتعالى فەرمووی: ( **سَأُصْلِيهِ سَقَرَ** ) [94] ، وە هەندێكی تریان گوتیان: شیعرە ، الله ـش فەرمووی: ( **وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُّبِينٌ** ) [95] ، وە كاتێك كە الله نەفی ئەوەی كرد كە ئەم قورئانە شعر بێت و جێگیری كرد كە قورئانە ، هیچ گومانێك نەمایەوە بۆ هیچ كەسێك لەوەی كە قورئان ئەو پەرتووكە عەرەبییەیە كە بریتیە لە وشە و پیت و ئایەت ، چونكە شتێك بەو

---

(90) سورة فصلت: 42 .

(91) سورة الإسراء: 88 .

(92) سورة سبأ: 31 .

(93) سورة المدثر: 25 .

(94) سورة المدثر: 26 .

(95) سورة يس: 69 .

شێوەیە بێت کەس پێی نالێت: شیعرە ، وە الله دەفەرمووێت: ( **وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ** )[96] وە دروست نییە تەحەدا کردنیان هێنانی هاوشێوەی ئەوەی کە نازانرێت چۆنە ، وە عەقڵ درکی پێ ناکات ، وە الله فەرموویەتی: ( **وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ ۙ قَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَٰذَا أَوْ بَدِّلْهُ ۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاءِ نَفْسِي** )[97] ، وە ئەوەی سەلماندووە کە قورئان ئەو ئایەتانەن کە بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە ، وە الله تعالى فەرموویەتی: ( **بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ** )[98] ، وە فەرموویەتی : ( **إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ * فِي كِتَابٍ مَّكْنُونٍ * لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ** )[99] ، دوای ئەوەی کە سوێندی خواردووە لەسەرئەوە ، وە فەرموویەتی: ( **كهيعص** )[100] ، ( **حم عسق** )[101] ، وە بیست و هەشت سورەتی بەپیتە بڕاوەکان دەست پێکردووە ، وە پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی: ( **هەرکەسێك قورئان بخوێنێتەوە و لێکی بداتەوە بۆ هەر پیتێك دە ( 10 ) چاکەی بۆ هەیە ، وە ئەوەشی بیخوێنێتەوە و ئاوازی تیا بخات ، ئەوە بۆ هەر پیتێك یەك ( 1 ) چاکەی بۆ هەیە** ) ، فەرموودەیەکی صحیحە وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی: ( **قورئان بخوێننەوە پێش ئەوەی قەومانێك بێن هەڵسن بە پیتەکانی وەك هەڵسان بە تیر لەگەردنیان ناچێتە خوارەوە و پەلە دەکەن لە پاداشتی و دوای ناخەن** )[102] .

وە ئەبوبەکر ( الله تعالى لێی ڕازی بێت ) فەرمووی: ( لێکدانەوەی قورئان خۆشترە لامان لە لەبەرکردنی هەندێك لە پیتەکانی ) .

---

(96) سورة البقرة: 23 .

(97) سورة يونس: 15 .

(98) سورة العنكبوت: 49 .

(99) سورة الواقعة: 77 _ 78 _ 79 .

(100) سورة مريم: 1 .

(101) سورة الشورى: 1 _ 2 .

(102) رواه أحمد في مسنده 64/3 (ح11632) .

وە علی ( الله تعالی لێی ڕازی بێت ) فەرموویەتی : ( هەرکەسێك بێباوەڕ بێت بەیەك پیتی قـورئان ئـەوا بێبـاوەڕ بـووە بـەهـەمـووی ، وە موسـڵمانان کـۆدەنگـن لـەسـەر ژمـاردنی سـورەتـەکانی قـورئان و ئایـەتـەکانی و وشـەکانی و پیتـەکانی ، وە هـیچ ڕاجیاییـەك نییـە لەنێوان موسڵمانان لەوەی هەرکەسێك نکۆڵی لەسورەتێك لە قورئان بکات ، یاخود ئایەتێك یاخود وشەیەك یاخود پیتێکی کۆدەنگی لەسەر ، ئەویش کافرە ، ئەوەش بەڵگەیەکی نەبڕاوەیە لەوەی پیتە ) .

## ڕوونکردنەوە :

**پرسێك:** نوسەر ( ڕەحمەتی الله ی لێبێت ) قسەی کردووە لەسەر ئەو بڕگەیە سەبارەت بەپرسێك ئەویش قورئانە ئایا قسەی الله یە یاخود قسەی الله نییە ؟

ئەوەش فراوانییە و درێژەپێدەرە بۆ صیفەتی قسە بۆ الله تعالی ئەوە نەبێت کە نوسەر بەتەنها قورئانی باسکردووە بەسەربەخۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە قسەی الله یە ، هۆکاری ئەوەش ئەوەیە کە پەکخەران لەسەردەمی ئەودا ئینکاریان لەوە دەکرد کە قورئان قسەی الله تعالی بێت ، بەڵکو ئەوە جێبەجێ دەبێت لای تێکڕای پەکخەران ، بۆیە نوسەر باسی بەڵگەیەکی زۆری کردووە لە ئایەت و فەرموودەکان .

**پرسی دووەم :**

**1_ مەزهەبی ئەهلی سوننە سەبارەت بە قورئان :**

ئەهلی سوننە بەکۆدەنگی دەڵێن: قورئان وتەی الله یە دابەزیووە و دروستکراو نییە لەئەوەوە هاتووە و بۆ لای ئەویش دەگەڕێتەوە .

**2_ مەزهەبی پەکخەران لەجەهمیەکان و موعتەزلیەکان و ماتوریدییەکان و ئەشعەریەکان :**

دەڵێن: قورئان وتەی الله یە بەڵام دروستکراوە .

3_ **مەزهەبی ڕاوەستاوان** : ئەوانەن کە دەڵێن قورئان وتەی الله یە ، دواتر لەئەوەندەوە دەوەستن و ناڵێن ئایا دروستکراوە یان دروستکراو نییە ، لەسەر ئەوە دەوەستن .

4_ **لەفزیەکان**: ئەوانەن کە دەڵێن گوتنەوەی ئێمە بۆ قورئان دروستکراوە ، یاخود گوتنەوەی من بۆ قورئان دروستکراوە ، ئەوانەش بەشێکن لەجەهمیەکان و مەبەستیان لەو قسەیەیان گوتنەوەی ئێمە دروستکراوە مەبەستیان لەو لەفزەیە کە دەگوترێتەوە واتە قورئان و مەبەستیان لە لەفز لەوتەکانی گوتنەوەکەیە یاخود قسەکەر وە ئەو کۆمەڵەیەش لەسەردەمی خەلیفە متوکل دروست بون ، کاتێك کە جەهمیەکان شکستیان هێنا و شکان دوای ئەوەی کەپێشتر بەهێزبوون لەسەردەمی مەئمون و واثق و معتصم ، بۆیە کە متوکل هات و دەستی کرد بە جەنگان دژی جەهمیەکان ئەوا جەهمییەکان دەستیان کرد بەشاردنەوە مەنهەجیان بەو قسەیە ، لەجیاتی ئەوەی بڵێت قورئان مەخلوقە وەك چۆن لەکاتی بەهێزیان وایان دەگوت و ئاماژەیان پێ ئەدا گۆڕیانەوە بەدەربڕینێکی تر کەسەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆیان ڕانەکێشێت ، ئەوەش دەربڕینێکی درۆیینەیە هەق و باطڵی لێوەردەگیرێت ، جا گوتیان گوتنەوەمان بۆ قورئان دروستکراوە و مەبەستیشیان لەوە قورئانە ، ئەوانەش ئیمامی احمد و ئەوانەی لەگەڵی بوون ئاشکرایان کردن بەوهۆیەوە کافریان کردن و گوتیان ئەوانە جەهمین .

**پرسێك :**

هاتووە لەهەندێك لە سەلەفەوە کە دەڵێت: کردەوەی بەندەکان دروستکراوە و لەفزیش بەشێکە لە کردەوەی بەندەکان و مەبەستیش لە لەفز ئەوەیە کە دەگوترێتەوە واتە دەنگی ئێمە و قسەمان دروستکراوە ، بەڵام گوتراوە کە قورئانە ئەوا دروستکراو نییە ، وە لەسەلەفیش فەرموویەتی: کردەوەی بەندەکان دروستکراوە ، کاتێك کە پرسیاری لێکراوە دەربارەی لەفز ، ئەوەشیان قسەی إمامی بوخاریە وە امامی ابن قتيبة و ابن تيمية یە کە لەدواتر دێت ، وە ابن قتيبة ڕیسالەیەکی دانا بەناونیشانی ڕاجیای لەفز ، وە ئەو قسەیەی سەرخستووە ، وە کێشە بۆ بوخاری دروست بووە بەهۆی ئەو دەربڕینەی و

کەوتە نێو کێشمە کێشمێ لەگەڵ هەندێك لە ئەهلی سوننە لەڕووداوێکی ناسراودا ، وە ابن تیمیة هات و قسەکەی بوخاری ڕاستکرد و سەری خست ، وە وتی: گوتنەوەی قورئان دروستکراوە ئەگەر مەبەستی لە گوتنەوەکە بێت ئەوا دروستکراوە و ئەگەر مەبەستیشی لە بێژەری قورئانە ئەوا ئەوەیان قسەی جەهمیەکانە .
وە ئەوەشی ڕوویدا لەنێوان بوخاری و هەندێك لە ئەهلی حدیث دادەنرێت بە یەکەم ڕاجیایی کە ڕوویدا لەنێوان ئەهلی حدیث ، وە یەکەم خیلاف بوو ترازان و کۆمەڵ کۆمەڵی بەدوای خۆیدا هێنا ، وە قسە و هەڵویستی دیاریکراوی بەدوای خۆیدا هێنا ، وە ئەو باسەش ئێستا ڕوون بوویەوە ، وە دابەشکردنەکەش کرا لەوەی خەڵکی لەسەرین لەسەر ئەوەی ابن تیمیة فەرموویەتی: ئەوەی بڵێت گوتنەوەمان بە قورئان دروستکراوە و چی لێیەوە وەردەگیرێت ، وە لەژێر ڕۆشنایی تەفسیرکردنی بەوە حوکمی لەسەر دەدرێت ئایا لەجەهمیەکانە یاخود لەو کەسانەیە کە ڕای بوخاری لا پەسەندە .

ئەوە نەبێت کە ئێمە لەوانەیە سود وەربگرین لەوەی ڕوویداوە لەنێوان بوخاری و نێوان پێچەوانانی لەئەهلی سوننە لەو لەفزانەی کە بە لەفزی بیدعەچیان دەچێت چاکترە وازهێنان لێی و نەگوتنەوەی بۆئەوەی نەبێتە هۆی وەرگرتن و ڕەتکردنەوە و یاخود ئەهلی بیدعە پشتی پێنەبەستن و خۆیانی پێ سەربخەن ، بۆیە لەوەی بۆم دەردەکەوێت و الله تعالی ـش زاناترە کە قسەکەی بوخاری ڕەتکراوەیە و هەقیش لەگەڵ ئەو کەسەیە کە بەرامبەر بوخاری بویەوە و لەسەروی هەموویان محمد بن یحیی الذهلي ، چونکە ئەو سەردەمە سەردەمی جەهمیەکان بوو جا ئەگەر ئەهلی سوننە گوتەی گوتنەوەی قورئان دروستکراو بڵێن ، یاخود کردەوەی بەندەکان دروستکراوە وەك وەڵامێك بۆ پرسیارەکە ئایا گوتنەوەکە دروستکراوە ؟ ئەگەر مەبەستیشیان مەبەستێکی چاکە بووبێت ، بەڵام دەربڕینەکە شاراوەیی تیایە ، وە گومانی خراپی پێ دەبردرێت و سەرخستن و یارمەتیدانی لێوە دەردەکەوێت بۆ ئەهلی بیدعەچیان ، چاکتر بوو کە وازی لێبهێنرێت ، وە گومانی تیا نییە کە فەوزا و کێشە و دژایەتی و ڕق و کینەی لێوە دەردەکەوێت و ئەهلی سوننە دوورن لەوە و بەهەمان شێوە ئەگەر ئەوەی بەرامبەرانی

امام بوخاری کردیان ڕەتکراوەیە بەهەمان شێوە ، کاتێك کە هەڵسان بەدەربڕینی هەڵویست بەکردەوە لە هەجرکردن و دەرکردن ، نەدەبوایە کە ئەمە ڕووی بدابایە ، الله لێی خۆشبێت و ڕەحم بەهەمووان بکات و ئەوان لەئێمە باشتر و چاکترن ، بەڵام ڕووبەڕووبوونەوەیەکە ڕێکە و بنەمایەکی سەبارەت بە لەفزە خەیاڵاویەکان لێ وەردەگیرێت کە واتاکانیان هەقە بەڵام دەربڕینەکەی بەدەربڕینەکانی ئەهلی بیدعەچیان دەچێت ، دواتر ئەگەر ئەو دەربڕینە خەیاڵاویانە روویاندا واجبە لەسەر ئەهلی سوننە ئامۆژگاری بکەن و عوزری بۆ بهێننەوە بەوە وە هەڵوێستی هەجرکردن و کێشەی بەرامبەر نەکەن کە هۆکارە بۆ لێکترازان ، بەڵام پێویستە بۆ ڕوونکردنەوەی هەق و ڕەتدانەوەی پێچەوانەکار لەو قسە دیاریکراوەی .

**پرسێك :**

وشەی دابەزێنراوە و دروستکراو نییە ، ئەو دەربڕینە سەلەف زۆر گوتویانەتەوە وە هەمیشە دوای ئەوە دەیڵێن کە دەلێن قورئان قسەی الله یە و دابەزێنراوە و دروستکراو نییە ، وە وتەی ( واجب ) ی نوسەر چونکە وازهێنان لێی سەرنجی گومان ڕادەکێشێت بۆ ئەو کەسەی کە باسی نەکراوە ، لەوانەیە کە ئەو قسەکەرە وای دەبینێت کە قورئان دروستکراوە بۆیە واجبە بگوترێت .

وە بەهەمان شێوە دەربڕینی: لەئەوەوە دەستی پێکردووە ، پێویستە بگوترێت ، وە واتای ( لەئەوەوە ) : لێرەوە لەسەرەتاوە واتە: قسەکە لەلایەن الله وە گوتراوە و لەئەوەوە هاتووە ، بەڵام ئەهلی بیدعە دەلێن: لە ( اللوح المحفوظ ) وە کە لای الله یە دەستی پێکردوە و هاتووە یاخود لەجوبریلەوە یاخود لە پێغەمبەرەوە ( صلی الله علیه وسلم ) ، وای دەبینن کەدەربڕینەکان دروستکراون جوبریل هێناویەتی یاخود پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) هێناویەتی ، یاخود دروستکراوە لە ( اللوح المحفوظ ) کە لای الله یە و جوبریل وەری گرتووە ، بەڵام وشەی: وە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە گوتنی و زیادکردنی لە بابی

خۆشەویستە ، وە وشەی بۆ ئەو ( إليه ) : ضەمیرەکە دەگەڕێتەوە بۆ قورئان وە **سەلەف تەفسیری گەڕانەوەی بۆ الله تەفسیر دەکەن بەدوو تەفسیر :**

1_ قورئان لە الله وە دەرچووە وەك دەڵێی لەئەوەوە و بۆ ئەویشەوە جا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەبێتە دڵنیاکردنەوەی وشەی لەئەوەوە دەستی پێکردووە .
2_ بۆ ئەو دەگەڕێتەوە ، واتە: بەرزدەکرێتەوە کە هاتووە لە ئەثەرەکانەوە کە قورئان لەکۆتا ڕۆژەکانی دونیادا لە سینگەکان هەلدەگیرێتەوە بۆ لای الله تعالى .

پاشان نوسەر قسەی کردووە لەسەر بیروباوەڕی ئەهلی سوننە سەبارەت بە قورئان ، وە هەموویشی دڵنیاییە مەبەستی پێی لەڕەتدانەوەی ئەهلی بیدعەچیانە .
لەوانەش وتەکەی: یەکەم و کۆتایی بۆ هەیە ، وە پاداشت و پاداشتی و دوو ئەوەندە ، دەگوترێتەوە لەسەر زوبانەکان ، پارێزراوە لەسینگەکان ، وە گوێ لێگیراوە لە گوێیەکان ، تا کۆتایی وتەکەی ڕەحمەتی الله لەسەری بێت .

پاشان بەڵگەکانی خستۆتەڕوو لەبەڵگەکانی قورئانەوە دەستی پێکردووە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە قورئان قسەی الله یە دواتر بەڵگە لەسوننەتدا ، وە کۆتایی بەباسەکەی هێناوە بە ڕوونکردنەوەی حوکمی ئەوەی ئینکاری بکات لە قورئان و فەرمووی: نەقڵکراوێك لە ئیمامی علیەوە ( الله لێی ڕازی بێت ) کەوا فەرموویەتی: ( ئەوەی بێباوەڕ بێت بەپیتێکی قورئان ئەوا بیباوەڕ بووە بەهەمووی ، وە فەرمووی: هیچ ڕاجیاییەك نییە لەنێوان موسڵمانان لەوەی ئەوەی نکۆڵی لەسورەتێك یاخود ئایەتێك یاخود وشەیەك یاخود پیتێك بکات لە قورئان کە کۆدەنگی لەسەرە ئەوە کافرە ) .

## بەشێك: بینینی ئیمانداران بۆ الله تعالى له قیامەتدا

### نوسەر فەرموویەتی :

ئیمانداران الله تعالى دەبینن لە ڕۆژی دواییدا بەچاوەکانیان و سەردانی دەکەن و قسەیان لەگەڵ دەکات و قسەی لەگەڵ دەکەن ، الله فەرموویەتی: ( **وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ * إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ** ) وە هەر الله فەرموویەتی: ( **كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ** ) بۆیە کاتێك بەربەست لەنێوان ئەواندا دانرا لەحاڵەتی تورەیی بەڵگەدەرە لەوەی ئیمانداران دەیبینن لەحاڵەتی ڕازیبووندا جا ئەگەر وا نەبوایە ئەوە هیچ جیاوازیەك نەئەبوو لەنێوانیان .

وە پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ( **ئێوە (لەقیامەت) پەروەردگارتان ئەبینن وەك چۆن ئەو مانگە ئەبینن ماندوو و بێزار نابن لەسەیرکردنی** ) متفق عليه .

ئەمەش وێکچواندنی بینینە بەبینین ( واتە بەچاوەکان خوا دەبینین ) بە بینین بە بینین نەك وەك بینینی مرۆڤ بۆ مرۆڤ چونکە الله تعالى هاوشێوە و نموونەی بۆ نییە .

### ڕوونکردنەوە :

نوسەر لێرەدا قسەی لەسەر بینینی قیامەت کردووە و بەشێکی سەربەخۆی بۆ دیاری کردووە ، فەرمووی: ( وە ئیمانداران پەروەردگاریان دەبینن لەقیامەتدا بەچاوەکانیان ) .

**وە بابەتی بینین چەند پرسێکی تیایە :**

1_ نوسەر قسەی لەسەر بینین کردووە لەڕۆژی دواییدا ، بەڵام پێش ڕۆژی دوایی ئایا بینین هەیە ؟ وە ئایا الله دەبینرێت لەدونیادا ؟

**پرسەکە دوو مەزهەبی تیایە ئەوەندەی بیزانم :**

**یەکەم**: مەزهەبی صۆفیەکان: ئەوانە وایدەبینن کە الله لەدونیادا دەبینرێت و پیاوچاکان الله دەبینن لەدونیادا و قسەیان لەگەڵ دەکات و قسەی لەگەڵ دەکەن .

**دووەم:** مەزهەبی سەلەف ئەوەیە کە الله لەدونیادا نابینرێت بەیەکدەنگی سەلەف وە پشتیان بەستووە بە وتەی الله تعالی: ( **لَن تَرَانِي وَلَٰكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ** ) (103) .
بەڵام سەلەف ڕاجیاییان هەبووە لەسەر پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) بەتایبەت ئایا ئەو ئالله ی بینیوە لەدونیادا یاخود نەی بینیوە ، وە ڕاجیاییەکە کەوتە نێوان هاوەڵانەوە :

**وتەی یەکەم: بریتییە لەوەی بەچاوی سەری خۆی نەی بینیوە .**
وە بۆ ئەمەش پشتیان بەستووە - ئەمە وتەی جمهوری زانایانە - بەفەرموودەکەی عائشە : ئەوەی بڵێت پێغەمبەر الله ی بینیوە ئەوە گەورەترین بوهتانی داوەتە پاڵ الله تعالی .
وە پشتیان بەستووە بە فەرموودەکەی أبو ذر ( الله لێی ڕازی بێت ) کاتێك پرسیاری کرد لەپێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) : ئایا پەروەردگارەکەت بینیوە ؟ پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی: من نور و ڕووناکی دەبینم .

**وە وتەی دووەم : بریتیە لەوەی دەبینرێت .**
بۆ ئەمەش پشتیان بەستووە بە وتەی الله تعالی: ( **وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ** ) (104) ، وە وتەی الله : ( **ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ * فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ** ) (105) ، وە فەرموودەی: ( پەروەردگاری خۆمم بینی بەباشترین وێنە ) (106) .
وە ڕاست و دروستیش وتەی یەکەمە .

**پاشان ئایا الله ی بینیوە بە بینینێك لەدڵیدا و لەخەودا لەدونیادا یاخود نا ؟**
ئەوەی دروستە ئەوەیە کە الله ی بینیوە لە خەودا ، ئەوەش هەڵبژاردنی ابن تیمیة یە کە ئەمەش دڵنیاییکەرەوەی وتەی پێغەمبەرە ( صلی الله علیه وسلم ) : ( پەروەردگاری خۆم

(103) سورة الأعراف: 143 .
(104) سورة النجم: 13 .
(105) سورة النجم: 8 _ 9 .
(106) رواه الترمذي في سننه 366/5 (ح3233) ، والدارمي 170/2 (ح2149) ، وأحمد 368/1 (ح3484) .

بینی به باشترین وێنه )، وه ئەوەش بەناوبانگە لەفەرموودەی گفتوگۆکردنی چاکترینی و بەرزترینی مەلائیکەتەکان ، وه ئەو فەرموودەیە إبن رجب ڕیسالەیەکی لەسەر داناوه .

**2_ ئایا الله له قیامەتدا دەبینرێت ؟**

ئەو پرسه چەند مەزهەبێکی تیایه :

أ_ **مەزهەبی ئەهلی سوننه و جەماعه** : ئەوەیه كه الله له قیامەتدا دەبینرێت لەدوو شوێندا ، لەشوێنی حیسابدا ، ئیمانداران بەچاوی خۆیان دەیبینن ، إبن تیمیة له الواسطیة باسی کردووه وه فەرمووی: الله دەبینن له شوێنی حیسابدا ، وه له بەهەشتیش دەبینرێت و ئەوەش ئەوەیه کەنوسەر ئاماژەی پێداوه بەوتەکەی: سەردانیان دەکات و سەردانی دەکەن و قسەیان لەگەڵ دەکات و قسەی لەگەڵ دەکەن ، ئەوه نەبێت که ئیمانداران پلەیان هەیه بۆ بینینی بەپێی پلەیان ، هەیانه هەموو ڕۆژێك دەیبینێت و هەشیانه هەموو هەینیەك دەیبینێت ، هەشیان لەسەرەوەی ئەوه دەیبینێت ، وه بینینی الله گەورەترین نیعمەتی بەهەشته .

وه ئەهلی سوننه و جەماعه ڕاجیاییان کەوتووەته نێوانیان سەبارەت بەبینینی کافران بۆ الله تعالی له قیامەتدا ، ڕاجیاییەکەش لەو بارەیەوه نزیکەی لەسەدەی سێیهەم سەری هەڵدا **لەسەر سێ ووته :**

**وتەی یەکەم**: ئەوەیه که کافران بەهیچ شێوەیەك الله تعالی نابینن ئەگەر ئەو کافره چ کافری ئەصلی بێت چ کافری هەڵگەڕاوه بێت ( مورتەد ) ، یاخود هەرکەسێك که ئیمان دەربخات و کوفر بشارێتەوه لەدڵیدا که دووڕوانن و هاوشێوەکانیان ، هیچ کەسێك لەوانه الله تعالی نابینن لەڕۆژی قیامەتدا ، ئەوەش ئەوەیه کەنوسەر هەڵیبژاردووه ، بۆیه الله تعالی فەرموویەتی: ( **كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ** ) (سورة المطففون: 15) ، بۆیه کاتێك بەربەست لەنێوان ئەواندا دانرا لەحاڵەتی توڕەیی بەڵگەدەره لەوەی ئیمانداران دەیبینن له حاڵەتی ڕازیبووندا جا ئەگەر وا نەبوایه ئەوه هیچ جیاوازیەك نەئەبوو لەنێوانیان .

**وتەی دووەم:** ئەوەیە کە کافری ئەصلی الله نابینێت بەڵام دووڕوو ( منافق ) کە ئەو کەسەیە کە ئیمان دەردەخات لەڕووکەشدا و کوفر لەدڵیدا دەشارێتەوە ، ئەوەیان الله دەبینێت لە کاتی حساب لەڕۆژی قیامەتدا ، دواتر الله بەربەست دادەنێت لەوەی بیبینن ، وە ابن خزیمة لەکتێبی التوحید دا ئەو ڕایەی هەڵبژاردووە .

**وتەی سێیەم:** ئەوەیە کە کافران الله دەبینن بەڵام بینینێکی سزایە وەك دز کە دەسەڵاتدار دەیبینێت ، وە پشتیان بەستووە بۆ ئەوە بەفەرموودەکانی گەشتن بەدیدار و قسەکردن ، چونکە الله قسە لەگەڵ کافردا دەکات ، وە لای ئەوانە قسەکردن و گەیشتن بە دیداری پێویست دەکات بۆ بینینی ، الله ش زاناترە بە دروستی ئەو پرسە ، بەڵام وتەی یەکەم بەهێزترە .

**پرسێك: مەزهەبەکانی خەڵکی لە باسی بینینی الله :**

أ_ **مەزهەبی ئەشعەریەکان:** ئەوانەش بینینی الله جێگیردەکەن و دەڵێن الله لەقیامەتدا دەبینرێت ، بەڵام دەڵێن دەیبینن بەبینینێك کە ڕووبەڕوو نییە چونکە ئەوانە بەرزبونەوە بۆ الله جێگیر ناکەن ، وە دەڵێن بینینێکە وەك سەیرکردن نییە ، وە بینینی الله دەکەن بەبینینێکی زانستی ، بە واتای زانست و دڵنیایی و پەردەلادانە ، ئەمەش لەڕاستیدا ڕەتکردنەوەی بینینی الله یە لەلایەن ئیماندارانەوە ، بەڵکو بەو قسەیەیان دەیشارنەوە کە دەڵێن الله دەبینرێت ، جا ئەگەر گوترا چۆن دەبینرێت ؟ ئایا بەچاوەکانیان الله دەبینن ؟ دەڵێن: نەخێر ، بەڵکو بەدڵیان الله دەبینن .

ب_ **ماتوریدییەکان:** ئەوانەش مەزهەبیان وەك مەزهەبی ئەشعەریەکانە وەك لەپێشوودا باسکرا .

ج_ **مەزهەبی موعتەزیلەکان و جەهمیەکان و خەواریجەکان و ڕافضەکان** : ئەوانەش نەفی بینین دەکەن بۆ الله و ڕەتی دەکەنەوە و دەڵێن: الله نابینرێت نە لەدونیا و نە لەقیامەتدا .

وه نوسەر ئەو بەڵگانەی هێناوەتەوە کە باسی بینینی الله دەکەن :

1ـ وتەی الله تعالی: ( **إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ** ) [107] .

2ـ وتەی الله تعالی: ( **كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ** ) [108] ، وە بەڵگەش بۆ ئەوە بە پێچەوانەکەی دەبێت .

جا ئەگەر کافران کافران لەو ڕۆژەدا بەربەستیان بۆ دروست ببێت لەبینینی الله تعالی دا ، جا تێگەشتنی پێچەوانەکەی بەڵگەیە لەوەی کە ئیمانداران بەربەستیان نابێت بەڵکو دەیبینن .

3ـ لە سوننەتدا : فەرموودەی : ( ئێوە ( لەقیامەتدا ) پەروەردگارتان ئەبینن وەك چۆن ئەو مانگە ئەبینن ) .

نوسەر لەکۆتایی لیکۆلینەوەکەیدا ئاماژەی داوە بە پرسێك کەوا پەیوەستە بەفەرموودەکەوە [109] : ( ئێوە ( لەقیامەتدا ) پەروەردگارتان ئەبینن وەك چۆن ئەو مانگە ئەبینن ) ، لەوانەیە کەسێك بڵێت: وتەی: ( وەك چۆن ئەو مانگە ئەبینن بەوەی پیتی (کافی لکاو بە ما ) بۆ وێکچواندنە ، و بریتیە لە وێکچواندنی الله بە مانگ ، بۆیە نوسەر ڕەتی ئەو تێکەڵیەی داوەتەوە ، وە فەرموویەتی: وێکچواندن بریتییە لەوێکچواندنی بینین بە بینین نەك وێکچواندنی مرۆڤ بە مرۆڤ ، وە ئەوەشی بەڵگەیە بۆ ئەوە ئەوەیە کە الله هیچ هاوشێوە و نموونەی بۆ نییە .

(107) سورة القيامة: 23 .

(108) سورة المطففين: 15 .

(109) أخرجه البخاري في صحيحه 209/1 (ح547)، 277/1 (ح773)، ومسلم في صحيحه 163/1 (ح182).

## بەشێك دەربارەی قەزا و قەدەر

**نوسەر فەرموویەتی :**

لەصیفەتەکانی الله تعالی دا ئەوەیە کە الله بڕیاردەرە لەوەی کە ویستی لەسەرە هیچ شتێك نابێت و ڕوونادات ئیللا بە ویستی ئەو نەبێت و هیچ شتێك لەژێر ویستی ئەو دەرناچێت ، وە لەو جیهانەدا هیچ شتێك لەژێر قەدەری ئەو دەرناچێت و هیچ شتێك ڕوونادات مەگەر لەئەوەوە نەبێت ، وە هیچ لادەرێك نییە لەو قەدەرەی لەلایەن الله بەئەندازە دانراوە ، وە ئەوە سنورە نابەزێنرێت کە لە ( **اللوح المحفوظ** ) دا هەیە ، ئەوەی ویست کە جیهان چییە و بەو شێوەیە دیاری کردن جا ئەگەر بیانی پاراستبوایە ئەوا پێچەوانەیان نەدەکرد و ئەگەر ویستی لەسەر بوایە هەموو خەلکی گوێڕایەلی بکەن ئەوا گوێڕایەلیان دەکرد .

دروستکراوەکان و کردەوەکانیانی دروست کردووە و رزق و ئەجەلیانی دیاریکردووە ، ڕێنموونی هەرکەسێك ئەکات کە ویستی لەسەرە و هەر کەسێکیش کە ویستی لەسەر بێت گومڕای دەکات بە لێزانینی خۆی ، الله تعالی فەرموویەتی: ( **لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ** ) وە فەرموویەتی: ( **إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ** ) وەفەرموویەتی: ( **وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا** ) وە فەرموویەتی: ( **مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ** ) وە فەرموویەتی: ( **فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا** ) .

وە ابن عمر ( الله لێی ڕازی بێت ) گێڕاویەتیەوە کەوا جوبریل علیه السلام بەپێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) ی فەرموو ئیمان چییە ؟ ، پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی: ( **بریتیە لەوەی بڕوا بهێنیت بە الله و مەلائیکەتەکانی و پەرتوکەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و بەقەدەر بەچاك و خراپی** ) جبریل فەرمووی: ڕاستت گوت ، موسلیم ڕیوایەتی کردووە ، وە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی: ( **بڕوام هێنا بە قەدەر بەچاکی و خراپی و خۆش و ناخۆشی** ) .

وە لەپاڕانەوەکانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) کە فێری حوسەینی کوڕی علی دەکرد کە پاڕاناوەی پێ بکات لە قنوتی ویتردا : (( بم بپارێزە لە خراپەی ئەوەی بەقەدەر بڕیارت داوە لەسەری )) .

وە قەزا و قەدەری الله ناکەینە بەهانەیەك لەسەر خۆمان بۆ وازهێنان لەفەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لە ڕێگریەکانی بەڵکو پێویستە ئیمانی پێ بهێنین و بزانین کە الله بەهانەیە لەسەرمان بەدابەزاندنی کتێبەکان و ناردنی پێغەمبەران ، الله تعالی فەرموویەتی : **( لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ )** .

وە دەزانین کە الله تعالی فەرمان و ڕێگری نەکردووە تەنها بۆ کەسێکی لەتواناهەبوو بۆ ئەنجامدانی کردەوەکان و وازهێنان لێیان و ئەو کەسی ناچار نەکردووە لەسەر ئەنجامدانی تاوان وە کەسیشی ناچار نەکردووە لەسەر وازهێنان لەگوێڕایەلی خۆی ، الله تعالی فەرموویەتی: ( **لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا** ) وە فەرموویەتی: ( **فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ** ) وە فەرموویەتی: ( **الْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ ۚ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ** ) ئەم ئایەتانە بەڵگەیان دا لەوەی کە بەندەکان کردەوە و دەستکەوتیان هەیە بۆ کردەوەی چاکە پاداشت دەدرێنەوە و بۆ خراپەش بە سزا پاداشت دەدرێنەوە ، وە ئەوانەش گرێدراون بە قەزا و قەدەری الله .

## ڕوونکردنەوە :

**چەند پرسێکی تێدایە :**

**پرسی یەکەم**: بۆچی نوسەر باسی بابەتی قەزا و قەدەری کردووە و گرێیداوە بەباسی صیفەتەکان ؟

**وەڵام**: نوسەر دەقی ڕوونی لەسەرداوە ، فەرموویەتی: وە لەصیفەتەکانی الله بریتیە لەوەی الله بەتوانایە بۆ ئەو شتەی ویستی لەسەرە ، دواتر باسی ئەوەی کردووە کە لەصیفەتەکانی الله بریتیە لەویستن و ئارەزوولێبون ، وە دواتر نوسەر دەرنەچووە لەباسی صیفەتەکان ، هەر ئەو بڕیار ئەدات و قەدەر دیاری دەکات و ئارەزوو و ویستی هەیە .

ئەوەی بنچینەیە لەو پرسەدا ، بریتییە لەباسکردنی صیفەتی ئەوەی الله بەتوانایە بۆ ئەوەی ویستی لەسەرە ، وە باسی صیفەتی ویستن و ئارەزوو لێبونی کردووە بۆ الله پاشان باسی هەندێك پرس و لایەنی قەزا و قەدەری کردووە ، چونکە پەیوەندیان هەیە بەهەردوو صیفەتی ویستن و ئارەزوو لێبوون ( الإرادة والمشيئة ) وە ئەوەی کە الله بەتوانایە بۆ ئەوەی کە دەیەوێت و ویستی لەسەرە ، دواتر دە ( 10 ) پرسی هێناوەتەوە لەو لایەنانەی کە پەیوەستن بە قەزا و قەدەرەوە ئەوانیش :

1_ پرسی بەیەك گرێدراوی قەزا و قەدەر بە ویست و ئارەزووی الله تعالی وە ، نوسەر فەرمووی: ( **هیچ شتێك نابێت و ڕوونادات ئیللا بە ویستی ئەو نەبێت و هیچ شتێك لەژێر ویستی ئەو دەرناچێت** ) کە بریتیە لەیەکێك لەپلەوپایەکانی قەزا و قەدەر .
2_ پرسی گشتگیری قەزا و قەدەر لە وتەکەی: ( **لەم جیهانە هیچ شتێك لەژێر قەدەری ئەو دەرناچێت و هیچ شتێك ڕوونادات مەگەر لەوەوە نەبێت** ) .

3_ پرسی جێبەجێ بوونی و پەیوەست بوونی: ( **وە هیچ لادەرێك نییە لەو قەدەرەی لەلایەن الله بەئەندازە دانراوە** ) .
4_ پرسی ( اللوح المحفوظ ) و پەیوەندیەکەی بەقەدەرەوە: ( **وە ئەوە سنورە نابەزێنرێت کە لە پەرتووکی هەڵگیراو ( اللوح المسطور ) دا هەیە** ) .
5_ پرسی پەیوەست بەویستی الله بۆ کردەوەی بەندەکان: ( **ئەوەی ویست کە جیهان چییە و بەو شێوەیە دیاری کردن** ) .

6_ پرسی ملکەچی و پارێزراو نەبوون لە وتەکەی: ( **ئەگەر بیانی پاراستبوایە ئەوا پێچەوانەیان نەدەکرد** ) .
7_ پرسێك لە پەیوەستبوونی ویست بەکردەوەی بەندەکان: ( **وە ئەگەر ویستی لەسەر بوایە هەموو خەڵکی گوێڕایەڵی بکەن ئەوا گوێڕایەڵیان دەکرد** ) .
8_ پرسی دروستکردنی کردەوەی بەندەکان: ( **دروستکراوەکان و کردەوەکانیانی دروست کردووە** ) .

9_ وە لەپرسەکانی قەدەر پرسی گومڕای و ڕێنموونییە لە وتەکەی: ( **ڕێنمونی هەر کەسێك ئەکات کە ویستی لەسەرە و هەر کەسێکیش کە ویستی لەسەر بێت گومڕای دەکات بەلێزانینی خۆی** ) .
10_ پرسی دیاریکردنی ڕزق و ئەجەلەکان: ( **رزق و ئەجەلیانی دیاریکردووە** ) .

ئەوەیان دە ( 10 ) پرسە لەباسەکانی قەدەر عادەتەن زانایان بۆ پرسی قەزا و قەدەر باسی دەکەن نوسەریش ئاماژەیێکی خێرای پێداوە وە تیایدا مەزهەب و بیروباوەڕی سەلەفی تێدا ڕوون کردۆتەوە لەسەر هەموو پرسێك لە دە ( 10 ) پرسەکە .

**پاشان لەکۆتایی بەشەکەی قەزا و قەدەردا چوار پرسی هێناوەتەوە کە گرێدراون بە قەدەر ، ئەوانیش :**
1_ پرسی کردنە بەڵگەی قەدەر لەسەرپێچی و گوێڕایەڵ نەبوون ، بۆیە فەرموویەتی: ( **وە قەزا و قەدەری الله ناکەینە بەهانەیەك لەسەر خۆمان بۆ وازهێنان لەفەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لەڕێگرییەکانی** ) .

2_ پرسی توانا لە فەرمان و ڕێگرییەکان ئەنجامدانی یان وازهێنانی ، بۆیە فەرموویەتی :
(**وە دەزانین کە الله تعالى فەرمان و ڕێگری نەکردووە تەنها بۆ کەسێکی لەتواناهەبوو بۆ ئەنجامدانی کردەوەکان و وازهێنان لێیان** ) .

3_ پرسی ناچاربوون و هەڵبژاردن ، لەوتەکەی: ( **وە ئەو کەسی ناچار نەکردووە لەسەر ئەنجامدانی تاوان وە کەسیشی ناچار نەکردووە لەسەر وازهێنان لەگوێڕایەلی خۆی** ) .

4_ پرسی دەسکەوت و پەیوەندی بە قەدەرەوە ، لەوتەکەی: ( **بەندەکان کردەوە و دەستکەوتیان هەیە بۆ کردەوەی چاکە پاداشت دەدرێنەوە و بۆ خراپەش بە سزا پاداشت دەدرێنەوە ، وە ئەوانەش گرێدراون بەقەزا و قەدەری الله** ) .
تێکڕایان چواردە پرسن کە پەیوەندیان هەیە بە قەدەرەوە .

**پرسی دووەم:** نوسەر لە سەرەتای باسەکەیدا ( قەزا و قەدەر ) و لێرەدا قەدەر ڕووی دراوە بۆ لای قەزادا ، وە پیتی ( واو ) ـەکە بۆ پێچەوانەکەیەتی ئایا هیچ جیاوازیەك لەنێوانیان هەیە یاخود هەردووکیان بەیەك واتا دێن ؟

**وەڵام:** قەزا و قەدەر وەك بابەتی ئیسلام و ئیمانە ، ئەگەر کۆببنەوە ئەوە جیادەبنەوە و ئەگەر جیا ببنەوە کۆدەبنەوە ، جا ئەگەر جودابونەوە و قەدەر بەتەنها باسکرا یاخود قەزا بەتەنها واتای ئەوەی تریان بۆ واتای ئەوەی تر دەچێت ، بەڵام ئەگەر کۆبوبونەوە ئەوا هەریەکێکیان تایبەت دەبن بە واتایەکی سەربەخۆ ، بەو شێوەیە قەدەر بە واتای ئەندازە دانان دێت واتە ئەوەی الله لەئەزەلەوە بەقەدەری داناوە ، وە زانستەکەی و کتێبەکانی ، وە واتای قەزاش واتە دروستکردنەکە ئەوەی کە بە بڕیار ئەیدات بەسەر بەندەکانی لەهەبوون و نەبونەوە ، بەو شێوە پلەی دروستکردن دەگرێتەوە ، لەسەر ئەو واتایەش قەدەر پێش قەزا دەکەوێت چونکە الله شتێك دەکاتە قەدەر بەزانست و ئارەزوو و بەنوسین دواتر قەزای ئەدات بە هەبوونی .

**مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە سەبارەت بە قەزا و قەدەر :**

ئەهلی سوننە و جەماعە بڕوا دەهێنن بە قەزاو قەدەر و دابەشی دەکەن بۆ چوار پلە: ابن تيمية ئاماژەی پێداوە لە واسطية دا ئەویش بەو شێوەیەیە :

أ__ **پلەی زانست ( العلم ) :** ئەویش ئەوەیە کە الله هەموو شتێك ئەزانێت ، وە زانستی هەبوو بەوەی دەبوو و بەوەشی کە نەدەبوو ، ئەو پلەیەش ئەهلی سوننە جێگیریان کردووە بەڵکو هەموو مەزهەبەکان جێگیریان کردووە ، جگە لەموعتەزیلە زێدەڕووچووەکان نەبێت کەئەوانە قەدەری یەکەمن ، ئەوانەش لەسەردەمی ابن عمر بوون و کافریانی کردووە .

ب__ **پلەی ویست و ئارەزوو لێبون ( المشيئة ) :** ئەویشیان ژێر کەوتەی ویستی الله و ئارەزوویەتی کاتێك کە زانی نوسی کە ببێت .

ج_ **پلەی نوسین ( الكتابة )** : ئەوەش ئەوەیە كە الله لەكتێبی پارێزراودا ( اللوح المحفوظ ) دا ئەو شتانەی نوسیوە كە دەبێت ئەوەشیان موعتەزیلە زێدەڕووچووەكان ئینكاریان لێكردووە ، وە هەموو مەزهەبەكانی تر دانیان پێناوە .
د_ **پلەی دروست كردن ( الخلق )** : كە بریتییە لە دروست كردنی شتەكان و دامەزراندنیان لەسەر ئەوەی كە زانیویەتی و ویستی لەسەر هەبووە و نوسویەتی ، ئەو پلەیەش ئەوەیە كە پێی دەگوترێت قەزا لەكاتێكدا كە لەگەل قەدەردا كۆببێتەوە ، ئەو پلانەی پێشووی پێی دەگوترێت قەدەر .

ب_ **مەزهەبی موعتەزیلەكان كە دوو بەشن :**
1_ موعتەزیلە زێدەڕووچووەكان : وە ناو دەبرێن بە قەدەریەكان ، ئەوانە ئینكاری دەكەن لە زانستی الله بۆ شتەكان و ویستی لەسەری و نوسینی بۆی ، چونكە ئەگەر ئینكارهی لە زانستی بكەن ئەوە زانراوە كە ئینكاری لەدوای زانست دەكەن كە ویست و ئارەزو و نوسین و دروستكردنە بۆ شتەكان .
2_ جگە لەموعتەزیلە زێدەڕووچووەكان : ئەوانەش ئەوانەن كە زانستی الله بۆ شتەكان جێگیر دەكەن وە نوسینیشی لەلایەن الله ـەوە جێگیردەكەن ، بەلام سەبارەت مەشیئەت و ویستی الله و دروستكردن ، دەڵێن هەندێك شت هەن كە الله ویستی لەسەر بوو و دورستی كرد ، كە ئەویش هەموو شتێكە جگە لە كردەوەی بەندەكان نەبێت ، ئەوەیان الله زانیویەتی وە نوسیویەتی بەڵام ویستی لێنەبووە و دروستی نەكردووە .

ج_ **مەزهەبی جەبریەكان**: ئەوانەش جەهمیەكان و ئەشعەریەكان و رافیضەن ئەوانەش دەڵێن كە بەندەكان ناچارن لەسەر كردنی كردەوەكانیان ، وە دروستیان نەكردووە ، بەڵكو الله ناچاری كردوون لەسەر كردنی ، هەرب ۆیە ناوبراون بەجەبریەكان .
نوسەر بۆ ئەوە پشتی بەبەڵگەیەك بەستووە لەوەش وتەی الله تعالی : ( **إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ**) [110] ، وە وتەی : ( **وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا** ) [111] ، وە وتەی : ( **مَا**

(110) سورة القمر: 49 .

**أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا )** [112] ، وە هەروەها وتەی : ( **فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ** ) [113] ، دوای ئەوە لە سوننەتدا پشتی بەستووە بەفەرموودەکەی جوبریل: ( وە ئیمان بهێنێ بەقەدەر بەچاکی و خراپی ) [114] .

د_ ئایا ئێمە فەرمانمان پێکراوە ڕازی ببین بەهەموو ئەو شتانەی کە الله بەقەزا و قەدەر بڕیاری لەسەر ئەدات ؟
ئەمە ڕوونکردنەوەی تیایە :
بەڵام قەزا و قەدەر کە کاری الله یە ، ئەوەیان بەهەمووی ڕازی دەبین هەموو چاکەیەکە و هەموو دادپەروەریەکە ، چونکە کرداری الله یە بەڵام سەبارەت بە ( المقضي ) کە کردەوەی بەندەکانە ئەوەیان ڕوونکردنەوەی تیایە :
پێخۆشبونی تیایە لەکردەوەی بەندەکان کە گوێڕایەلیانە وە پێناخۆشبون و ڕقلێبونەوەشی تیایە وەك سەرپێچیان ، بۆ نموونە کوشتن لەلایەنی کە الله نوسویەتی و ویستی لەسەربووە ئێمە پێی ڕازین و ملکەچی دەبین ، بەڵام سەبارەت بە بکوژ کە ئەوەیان کردەوەکەیەتی ، ئەوەیان ڕقمان لێیە و ڕازی نین پێی ، ئەگەر دژایەتیکەر بێت و پێمان خۆشە و پێی ڕازین کە کافران بکوژێت .

5_ وتەی : ( بەقەدەر بەچاکی و خراپی ) ئایا قەدەر خراپی تیایە ؟
دەلێین سەبارەت بەکردەوەی الله ئەوا خراپەی تیا نییە وەك لەفەرموودەی صەحیحدا : ( خراپە بۆ تۆ نییە ) [115] ، بەڵام سەبارەت بەئەنجامدەر ئەوا خراپەی تیایە ، شیطان

---

(111) سورة الفرقان: 2 .
(112) سورة الحديد: 22 .
(113) سورة الأنعام: 125 .
(114) رواه مسلم في صحيحه 36/1 (ح8) .
(115) رواه مسلم في صحيحه 534/1 (ح771) .

خراپەیە و کردەوەکانیشی خراپەیە ، الله تعالى فەرموویەتی : ( **ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ** ) .

6 ــ ئایا خراپە بەتاك دەدرێتە پاڵ الله تعالى ؟

ئەوەی تێبینی دەکرێت لە قورئان و سوننەت ئەوەیە کە خراپە دەدرێتە پاڵ هۆکارەکە وەك وتەی الله تعالى : ( **مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ** ) [116] ، یاخود ئەنجامدەری خراپەکە دەسڕدرێتەوە وەك وتەی الله : ( **وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا** ) [117] ، وە هەروەکو لەفەرموودەی : ( خراپە بۆ تۆ نییە ) .

**پرسێك: کردنە بەهانەی قەدەر لەسەر ئەنجامدانی تاوان و سەرپێچی :**

نوسەر فەرموویەتی: وە قەزا و قەدەری الله ناکەینە بەهانەیەك لەسەر خۆمان ، قەدەر بەڵگە و بەهانە نییە بۆ تاوان و سەرپێچی ، تاوان دەکات و دواتر دەڵێت: ئەوە شتێکە قەدەری الله یە ، یاخود ڕێگر ببێت لە گوێڕایەلی ، وە دەلێت: ئەگەر الله ویستی لەسەر هەبوایە ئەوا وای لێ ئەکردم تاوەك کارەکە ئەنجام بدەم ، بەڵگە و بەهانە بۆ الله یە و هەموو ئاسانکارێك بۆ ئەوە دروستکراوە ، بەڵکو ئەوە لە ڕێبازی نەفامیە ، گوتیان : ( **لَوْ شَاءَ الرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَاهُم** ) [118] ، وە وتەی : ( **لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا** ) [119] .

بەڵام قەدەر بکرێتە بەهانە بۆ بەڵا و ناخۆشی ئەوا ڕێگری تیا نییە وەك ئەوەی مرۆڤ هۆکارەکان بگرێتەبەر ، هۆکارەکانی سەلامەت بوون کاتێك کە سەفەری کرد بەڵام ڕوواوێکی توشبوو بۆی هەیە بلێت ( قەدەری الله یە و ئەوەی ویستی لەسەربوو ئەنجامی دا ) ئەو قەدەرەش الله نوسیویەتی لەسەرم لەوەی کە پشتبەستوو بەبەڵگە بیکاتە بەهانە لەسەری .

(116) سورة الفلق: 2 .

(117) سورة الجن: 10 .

(118) سورة الزخرف: 20 .

(119) سورة الأنعام: 148 .

ب ــ بـەهـەمـان شـێوە دروسـتە قـەدەر بکرێتـە بـەهانـە و بـەڵگـە لـەسـەر عـەیـب و کەموکورتیەکان ، ئەگەر تەوبەی لەسەر کردبێت وەك ئەگەر پشتبەستوو بەبەڵگە بیکاتە بەهانە ، لە تاوانێك کە پێشووتر ئەنجامیدابوو بەڵام تەوبەی لێکردووە ، بۆی هەیە بڵێت: قەدەری الله بووە لەسەرم بەڵام بەمەرجێك کە ئەو قسەیە بڵێت دوای ئەوەی کە تەوبەی لێکردووە ، لەبەر فەرموودەی چیرۆکی گفتوگۆکەی نێوان ئادەم و موسی علیهم الصلاة والسلام .

## بەشێك دەربارەی ئیمان

**نووسەر فەرموویەتی :**

ئیمان بریتیە لە ووتە بەزمان و کارکردن بەڕوکنەکان و گرێدانی بەدڵ و گیان ، زیاد دەبێت بەعیبادەت و گوێڕایەلیکردنی الله و کەم دەبێت بەتاوان و بەسەرپێچیکردنی ، الله تعالی فەرموویەتی: ( **وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاء وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ** ) لەم ئایەتەدا پەرستنی الله تعالی و نیەت پاکی دڵ و ئەنجامدانی نوێژ و دانی زەکات هەمووی بەدین داناوە ، پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : ( **ئیمان حەفتا و ئەوەندە بەشە بەرزترین بەشیان شایەدیدانە بە لا إله إلا الله ( واتە شایەدی بدەیت بەوەی کە هیچ پەرستراوێکی حەق نییە شایەنی پەرستن بێت تەنها الله نەبێت ) و نزمترین بەشیشی لابردنی ئازارێکە لەسەر ڕێگا** ) لێرەدا پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لەم فەرموودەیەدا ووتە و کردەوەی بەئیمان داناوە ، وە الله تعالی فەرموویەتی: ( **فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا** ) وە فەرموویەتی: ( **لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا** ) . وە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی: ( **لەئاگری دۆزەخ دەردەهێنرێت ئەو کەسەی وتبێتی لا إله إلا الله ( واتە وتبێتی: هیچ پەرستراوێکی حەق نییە شایەنی پەرستن بێت تەنها الله نەبێت ) وە بەقەد کێشی دەنکێك یاخود خەردەلێك یاخود گەردیلەیەك ئیمانی لەدڵدا هەبێت** ) ، ئیمانی کردە چەند پلەوپایەیەك .

پاشان نووسەر باسی چەند پرسێکی تایبەت بەئیمانی کردووە و ئەوەیشی پەیوەستە پێیەوە :

**پرسی یەکەم: پێناسەی ئیمان :**

لەزماندا ( لەڕووی زمانەوانییەوە ) : بەواتای بەڕاستدانان و دانپیانان دێت ، الله تعالی فەرموویەتی: ( **وَمَا أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لِّنَا** ) واتە بەڕاستیدانانی .

ڕاجیایی دروست بووە لەسەر پێناسەی ئیمان لەڕووی شەرعەوە ( لەڕووی زاراوەوە ) بەم شێوەیەی خوارەوە :

1_ **مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە**: ئیمان وتە و کردەوە و بیروباوەڕە ، ئەمەش بەکۆدەنگی سەلەف ، ئیمامی بوخاری لەکتێبی ( خلق أفعال العباد ) وتویەتی: زانیومە و پێم گەیشتووە لەهەزار زاناوە کە هەموویان وتوویانە: ئیمان وتە و کردەوەیە .

2_ **مەزهەبی جەهمییەکان**: وە هەروەها ناودەبرێن بە غلاة المرجئة ( مورجیئە زێدەڕووچووەکان ) ، ئیمان لای ئەمانە تەنها زانین و زانستە ( المعرفة والعلم ) ، وە هیچی تر ناخەنە نێو مسمای ئیمانەوە ، هەرکەسێك الله بناسێت و زانست و عیلمی هەبێت بە الله ئەوا ئەو کەسە ئیماندارە و ئیماندارێکی تەواویش ، وە ابن بطة مەزهەبی ئەم جەهمییانەی باسکردووە لەکتێبی ( الإبانة الكبرى ) .
وە هەروەها ابن تیمیة ـش باسی کردووە لەکتێبی ( الإیمان ) ، وە أبو یعلي ـش باسی کردووە لەکێتبی ( الإیمان ) ، وە أبو عبید ـیش باسی کردووە لەکتێبی ( الإیمان ) ، وە أبو الحسن الأشعري ـش باسی کردووە لەکتێبی ( مقالات الإسلامیین ) ، کاتێك باسی بیروباوەڕەکانی مورجیئەکان دەکرێت لەوتەکانیان ئەوە پێویست دەبێت و بەدی دەکرێت کەوا شەیتانیش ئیماندار بێت چونکە الله دەناسێت! ، وە ئەوەشیان لێ پێویست دەبێت و بەدی دەکرێت کە فیرعەون و قورەیش و أبي طالب ـیش لەئەهلی ئیمان بن ، چونکە زانست و زانینیان هەیە بە الله تعالى ، بۆیەش ناونراون غلاة المرجئة ( مورجیئە زەیدەڕووچووەکان ) .

3_ **مەزهەبی کەڕامییەکان**: لای ئەمانە ئیمان تەنها بریتیە لەوتەی زمان و بەڕاستدانان ناخەنە چوارچێوەی ئیمانەوە کە بریتیە لەزانین لەگەل وتە ، هەرکەسێك الله بناسێت وە بەزمانیش وشەی تەوحید ( لا إله إلا الله ) بلێت ئەوا ئەو کەسە ئیماندارە ، وە دەلێن مونافیق ( دووڕوو ) ئیماندارە وە ئەمەش دەقی وتەکەیانە چونکە بەزمان دەلێن: لا إله إلا الله ، وە لەڕۆژی دواییدا کافرن و تا هەتایە لەئاگردان ، وە لەدونیادا ئیماندارن ، ئەم کەڕامییانە لەپلەی دووەم دێن لەدوای جەهمییەکان لەڕووی غلو ( زێدەڕووچوویی ) .

4_ **مەزهەبی ئەشعەرییەکان**: ئەمانە لەبابەتی ئیماندا مورجیئەن ، وە وتەکانیان نزیکن لەوتەی جەهمییەکان ، ئەگەریش باشتربن لەوان لەڕووی إعتبارەوە ، تەنها ئەوە نەبێت کە لەگەڵ زانین بەڕاستدانانیش زیاد دەکەن ، دەڵێن: ئیمان بریتیە لەزانین و بەڕاستدانان .

5_ **مەزهەبی ماتوریدییەکان**: ئەمانەش تاقمێکن لەمورجیئەکان ، وە بەپێی مەزهەبی ئەوان ئیمان بریتیە لەزانین لەگەل زیادکردنی دانپیانان و بەڕاستدانان بەلام کردەوە ناخەنە نێو مسمای ئیمانەوە ، لەمەشدا وەکو ئەشعەرییەکانن .

6_ **مەزهەبی مورجیئەی فقهاء ( فقهاء المرجئة )** : مەزهەبەکەیان دەربارەی ئیمان بریتیە لەوتە و بەڕاستدانان لەگەڵ هەندێك لەکردەوەکانی دڵ وەکو خوشویستن و بەگەورەدانان و بەکەم دانەنان ، ئیمان وتە و بیروباوەڕە وە هەندێك لەکردەوەکانی دڵ ، الأشعري باسی ئەمانی کردووە لەکتابی ( مقالات الإسلاميين ) کاتێك قسە لەسەر مورجیئە ڕووچووەکان دەکات ، وە ابن تيمية یەش باسیان دەکات لەکتابی ( الإيمان ) .

7_ **مەزهەبی مورجیئەی سەردەم ( وە سەردەمیەکانیش هەموویان دەچنە چوارچێوەی ئەم مەزهەبە )** : لای ئەمانە ئیمان زانینە وە هەروەها بەڕاستدانانیش وە دانپیانانیش و کردەوە ناخەنە نێو مسمای ئیمان ، ئەم فیرقەیە تیایاندا هەیە و زۆربەشیان کردەوە دەخەنە نێو مسمای ئیمان ، بەڵام کردەوەکان بەمەرجێکی ئیمان دانانێن بەلکۆ بەمەرجی کامل بوونی ئیمان (تەواوێتی ئیمان ) دادەنێن ، وە بەکردەوەکان حوکمی کوفر نادەن ( واتە کەسێك بەکردار کوفرێك بکات کافری ناکەن مادام بەحەلال دانانی لەگەڵ نەبێت ) ، بەڵام کوفر لای ئەوان تەنها بەحەلال دانان و بەدرۆخستنەوەیە ، بۆیە ئەگەر هاتوو کوفرێك لەکەسێك دەرچوو ( بینرا ) یانیش کارێکی کرد چەندین دەق بەلگەبوون لەسەر ئەوەی ئەم کارە کوفرە ئەوا ئەمانە تەکفیری ئەم کەسە ناکەن تاوەکو بەزمان بەحەلال دانانەکەی یاخود بەدرۆخستنەوەی دەرنەخات .

8_ **مەزهەبی خەواریجەکان و موعتەزیلەکان**: تیایاندا هەیە ئیمان لایان وتە و کردەوە و بیروباوەڕە وەکو مەزهەبی سەلەف تەنها ئەوە نەبێت کە واتای کردەوە لای ئەوان هەموو ملکەچبوون و گوێڕایەلییەکان دەگرێتەوە ، واتە هەموو ملکەچبوون و گوێڕایەلییەکان ئیمانن و هەموویان مەرجن بۆ ئیمان و ئەو کەسە کافر دەبێت کە واز لەیەکێکیان بهێنێت ، بەڵام لای سەلەف کردەوەکان هەیانە مەرجە و وازهێنان لێی کوفرە وە کردەوەی واش هەیە واجبە و ئەو کەسە فاسق دەبێت بەوازلێهێنانی و کردەوەی واش هەیە سوننەتە . سەرچاوەی بۆ گەڕاوە : کتێبی ( الإیمان ) هی أبي عبید ، وە کتێبی (مقالات الإسلامیین) هی أبي حسن الأشعري .

9_ **بەلام خەواریجەکانی سەردەم** هەیانە تەکفیری خەلك دەکات ( واتە کۆمەلگا موسلمانەکان ) بەبێ هیچ ووردەکارییەك ، یانیش تەکفیری گشتی دەکات لەسەر ئاستی تاکەکان و بەدیاریکراوی و هیچ جیاوازییەك ناکات لەنێوانیان ، وە هەندێکیان تەکفیری گشتی ناکەن بەلام لەسەری دەوەستن وە ڕوونی دەکەنەوە بۆ ئەو کەسەی لەمڕۆدا ڕووکەشەکەی ئیسلامەتییە تاوەکو ئیسلامەتییەکەی ڕوون و ئاشکرا دەبێت .

10_ بەڵام مەزهەبی کاربەدەستەکان و عەلمانییەکان لەئەمڕۆدا دەربارەی ئیمان تەنها نوێژ و حەج و ڕۆژووە بەتەنها بەڵام سیاسەت و جیهاد و فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگریکردن لەخراپە و بانگەوازی و بابەتەکانی پەیوەست بەئافرەتان و فێرکردن و کۆمەڵگا و گۆڕانکاری و ڕووبەڕووبوونەوە لەئیمان نین بەڵکۆ بریتین لەتووندڕەویی و ئیرهاب و چوونە ناو بابەتێکە کەوا پەیوەندی بەوەوە نییە ، بەڵام ئەو عەلمانییانەی زێدەڕەون وەکو شیوعییەکان و نوێگەرییەکان ئەمانە هەر دان بەدیندا نانێن الله تعالی بیانکوژێت و نەفرەتیان لێبێ نەفرەتێکی گەورە .
ئەمە مەزهەبەکانی خەلکی بوو دەربارەی ئیمان .

نووسەر فەرموویەتی: ( **ئیمان وتەیە بەزمان** ) وتەی بەستەوە بەزمان ، وەکو هەردوو شەهادەتەکان ، ئەمەش بەرزترینی ئیمانی زمانە ، وەکو وتنی سبحان الله و لا إله إلا الله و

الله أكبر و خوێندنەوەی قورئان ، وە فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگریکردن لەخراپە و نموونەی وەکو ئەمانە .
نووسەر دەڵێت: ( **کارکردن بەڕوکنەکان** ) کردەوەی خستە نێو مسمای ئیمان .
نووسەر دەڵێت: ( **بەڕوکنەکان** ) ئەمەش دەوترێت کێشەی تێدا هەیە کە مەبەست لێی چییە ؟ واتە مەبەست چییە لەوەی کە دەڵێت ( کارکردن بەڕوکنەکان ) ؟

**ئایا مەبەستی لەڕوکنەکان ئەندامەکانی لاشەیە ؟**
ئەگەر هاتوو مەبەست لێی ئەمە بێت ، ئەوا دروستە کەوا کردەوەی ئەندامەکانی لاشە لەئیمانە بەڵام کردەوەی دڵ دەمێنێتەوە و کردەوەی دڵ لەگەورەترینی کردەوەکانی ئیمانە ، وە دەوترێت وتەکەی تەواو نییە و کەموکورتە .
ئەمەش ئەگەر تەفسیری ڕوکنەکانمان کرد بەئەندامەکانی لاشە ئەوا کردەوەی دڵی لێ دەچێتە دەرەوە ، مەبەستیش لە کردەوەی دڵ وەکو خوشویستن و ترسان ( الخوف والخشية ) و ملکەچبوون و ڕازیبوون و دڵنیابوون و پشت پێ بەستن و زەلیل بوون وە هەروەها بێجگە لەمانە لەکردەوەکانی دڵ کە لەگەورەترینی ئیمانن .
وە ئەگەر تەفسیری وتەکەیمان ( بەڕوکنەکان ) کرد بەپێنج ڕوکنەکان کە ڕوکنەکانی ئیسلامن ئەوا کارکردن بەڕوکنەکان لەئیمانە بەلام هەموو کردەوەکانی تر دەمێننەوە و ناچنە ناو ئیمانەوە وەکو جیهاد و فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگریکردن لەخراپە ، ئەمە لەپێنج ڕوکنەکان نین کە لەئیمانن ، **وە وتم ووتەی پێشوو تەنەزولی تێدایە** ، چونکە ئەوانەی ئەم قسەیە دەکەن بوونیان هەیە ، وە ئەوەی ڕەخنەدەگرێت لەوتەی زانایانی پێشوو لەسەر بنەمای ئەو زاراوە تایبەتیانەی کە لەلای ئەون کەوا پێشتر حوکمیان پێدراوە ؟
وە بۆ دەرچوون لەم ڕێگایە و زانینی ئەوەی دروستە لێرەدا ئەوا **پێویستە دوو شت بزانیت:**
أ __ ئەو شێوەیەی ئەم وتەیەی تێدا کراوە .

ب ــ زانینی ئەوەی ئایا بۆ ئەوان زاراوەیەکی دیارکراو هەبوو لەوەی دەیانووت یان نا ؟

ئەگەر هاتوو ئەم دوو بابەتەت ڕێکخست دوای ئەمە دەتوانیت بزانیت ئایا دەکرێت گفتوگۆی ئەوە بکرێت کە وتوویانە یان نا ؟ ، ئێستا دەگەڕێینەوە و دەڵێین ئایا ئەو شێوازە چۆن بووە لەوەی کە پێشتر وتویانە ؟.
ئەوان ئەمەیان وتووە ( وتنی کارکردن بەڕوکنەکان ) لەشێوازی ڕەتدانەوەی مورجیئەکان ، ئەوانەی کە ئەگەر کەسێك وازی لەهەموو ڕوکنەکان یانیش هەندێکیان بهێنابایە بەئیمانداریان دادەنا ، زانایانی پێشوو دەقیان دا لەسەر ڕوکنەکان و باسیان کرد لەڕەتدانەوەی ئەوان ( ڕەتدانەوەی مورجیئەکان ) .
پاشان ئەو دەستەواژانەی نووسەر لێرەدا بەکاریهێناون وەکو شوێنکەوتن بووە تێیدا بۆ زانایانی پێش خۆی ئەوانەی بەکاریانهێناوە وەکو الرزيان ، وە ابن بطة لەکتێبی ( الإبانة ) وە بێجگە لەوانیش ، پوختەی ئەم باسەش ئەوەیە کە ئەو لێکچووەی کە بەرامبەرە بۆ ڕەتکردنەوە ، ئەمەش ڕێگایەکی سەلەفییە لەپێناسەکردنەکان .

وە وتەی نووسەر: ( **گرێدانی بەدڵ ـ عقد بالجنان** ) وە مەبەستیش لە ( عقد ) واتە بیروباوەڕەکان وە بریتیە لەوەی لەدڵدایە لەبیروباوەڕ ، وە هەندێك لەسەلەفیش گرێدانی بەدڵ ( عقد بالجنان ) ناویان ناوە بەوتەی دڵ ( قول الجنان ) ، وە شوێن لەدڵدا شوێنی دەرك پێکردن و زانست و هزرە ، کە بریتیە لەبەڕاستدانانی هەموو ئەو شەریعەتەی کەوا پێغەمبەر ( عليه الصلاة والسلام ) پێی هاتووە و زانست هەبوون پێی و زانینی بەڵام زانینەکەی پەیوەستە بەبەڕاستدانان و دڵنیابوون .

نووسەر دەڵێت: ( **ئیمان زیاد دەبێت بەعیبادەت و گوێڕایەڵیکردنی الله و کەم دەبێت بەتاوان و سەرپێچیکردنی** ) ئەم بابەتەش زیادبوونی ئیمان و کەمبوونیەتی و **خەلکیش چەند مەزهەبێکە لەم بابەتەدا :**
1ــ **مەزهەبی سەلەف:** بریتیە لەوەی کەوا ئیمان زیاد دەبێت و کەم دەبێت .

2_ **مەزهەبی هەموو مورجیئە**: جا جەهمییەکان و کەڕامییەکان بن یاخود مورجیئەی فقهاء بن ، هەموویان دەلێن ئیمان زیاد نابێت و کەمیش نابێت بەلکۆ یەك شتە ، چونکە ئیمان لای ئەوان بەڕاستدانانە نە زیاد دەبێت وە نە کەمیش دەبێت ، وە هەروەها زانین و زانستە بێجگە لەهەندێك مورجیئەی سەردەم نەبێت کە ئیمان لایان زیاد دەبێت و کەمیش دەبێت وەکو مەزهەبی سەلەف .

3_ **مەزهەبی خەواریج و موعتەزیلەکان**: لای ئەمانە ئیمان زیاد ناکات وە کەمیش ناکات چونکە ئەگەر کەمی کرد ئەوا کوفرە ، وە ناکرێت زیادەی تێدا ڕووبدات ، تەنها ئەوە نەبێت کە لەلای مورجیئە هەندێك وردەکاری تێدایە دەربارەی بابەتی زیادبوونی ئیمان ، بە اعتباری ئەوەی ئیمان نە زیاد دەبێت وە نە کەم دەبێت ، بەڵام بە اعتباری مكلـف ( کەسی ڕاسپێردراو بەئەنجامدانی کارێك ) و تكليف ( ئەو کارەی واجبە ئەنجامدانی ) ئیمان زیاد دەبێت ، کەسی دەوڵەمەند کە مال و سامانی زۆری هەیە تەکلیفی زیاتری لەسەرە بۆیەش واجبە زەکات بدات ، ئەمەش ئیمانەکەی زیاترە لەهەژارێك کەوا زەکاتدان لەسەری واجب نییە ، لەم ڕووەوە ئیمانی کەسە دەوڵەمەندەکە زیاتر دەبێت لەئیمانی کەسە هەژارەکە .

بگەڕێوە سەر تحقيقی کتاب الإيمان هی أبي يعلى ، پەراوێزی لاپەڕە 397 ، تحقيقی الخلف ، دەربارەی ئەم بابەتــە لەلای هەمــوو ئەم تاقمانــە تەنهــا ئەهلی سوننە و جەماعە نەبێت ئیمان تەنها یەك شتە لایان و نەزیاد دەبێت وە نە کەم دەبێت ، جیاوازی ناکەن لەنێوان خەڵکدا لەبارەی ئیمان ، ئیمانی ئەبوبەکر ( الله تعالى لێی ڕازی بێت ) وەکو ئیمانی هەرکەسێکی ترە لەئیمانداران ، وە ئیمانی صحابەکان وەکو ئیمانی تابعینەکانە .

**پرسێك**

لەئیمامی مالکەوە هاتووە کەوا ئیمان زیاد دەبێت و کەم دەبێت ، بگەڕێوە سەر (التمهيد 9/252 ، والفتاوى لإبن تيمية 7/506 ، وە هەر لەمالکەوە هاتووە لەگێڕانەوەکەی ابن

القاسم کەوا ئیمامی مالك وتوویەتی ئیمان زیاد دەبێت وە توقفی کردووە لەکەم بوونی (واتە نەی وتووە ئیمان کەم دەبێت یاخود کەم نابێت) .

بەشێك لەمالیکییەکانیش لەسەر ئەم وتەیە ڕۆیشتوون بەو گومانەی کەوا ئیمامی مالك ئەمەی ووتبێت و وتیان: ئیمان زیاد دەبێت بەڵام کەم نابێت ، ئەم وتەیەش لاوازە و سەلەف لێی دوورکەوتوونەتەوە و وازیان لێ هێناوە ، پشتی پێ نابەسترێت و ناکرێتە بەڵگە ، إبن رجب باسی ئەمەی کردووە لە "فتح الباري" کاتێك شەرحی کتێبی الإیمان دەکات لە صحیحی بوخاری .
**پرسێك**: نووسەر باسی بابەتێکی کردووە ئەویش بریتیە ( هۆکارەکانی زیادبوونی ئیمان ) ، وتویەتی بریتیە لەعیبادەت و گوێڕایەلی کردنی الله ، وە باسی هۆکارەکانی کەم بوونی ئیمانی کردووە کە بریتیە لەتاوان و سەرپێچیکردنی الله .

**پرسێك**: ئیمان سەرەتای هەیە ئایا کۆتایی هەیە ؟ ـ واتە ئاستێك ( سەقفێك ) هەبێت لێی کۆتایی بێت ـ ؟.
**وەلام**: سەرەتای هەیە بەڵام کۆتایی نییە ، إبن بطة باسی ئەمەی کردووە لەکتێبەکەیدا الإبانة الصغرى ، لەبەشی "ئیمان" دا .

**پرسێك**: لەبارەی مورجیئەی فقهاء و لەبارەی ئەشعەرییەکان و لەبارەی ماتوریدییەکان : لەمە تێپەڕین کە ئەوان کردەوە ناخەنە نێو مسمای ئیمان ، وە کردەوەش بەئیمان ناونابەن ، ئەی چی ناوێکی لێ دەنێن ؟
**وەلام**: ناوی لێ دەنێن بەرهەمەکانی ئیمان ، یانیش دروشمەکانی ئیمان ، یانیش دەرئەنجامەکانی ئیمان ، یانیش بەڵگەکانی ئیمان ، بەڵام لەهەرچی حالەتێکدا بێت ناوی نانێن ئیمان .
بۆیە ئاگاداربە ئینسان دەبێت وریا بێت کاتێك هەندێك کتێبی عەقیدەیی دەخوێنێتەوە یانیش پلەوپایەی کردەوەکان (فضائل الأعمال) ، ئەگەر ویستیان باسی پلەوپایەکان

( الفضائل ) بكەن دەلێن: دروشمەكانی ئیمان ، بەڵام سەلەف دەڵێن كتێبی الإیمان و باسی كردەوەكان دەكەن .
دواتر نووسەر باسی كۆمەلێك بەڵگە دەكات لەسەر ئەوەی كە ئیمان وتە و كردەوە و بیروباوەڕە و زیاد دەبێت و كەمیش دەبێت ، باسی سێ بەڵگەی كردووە لەقورئان و دوو بەڵگەش لە سوننەتدا .

پاشان لەكۆتا بەشدا باسی بابەتی پلەكانی ئیمانی كردووە كە لەلایەن سەلەفەوە دەبێتە چەند پلەیەك وە ئەم بوونە چەند پلەیە لەدوو شتدا دەكەوێتەوە :
أ ــ ئیمان دەبێتە چەند پلەیەك .
ب ــ ئیمانداران چەند پلەیەكن تێیدا .
ئیمانی هەندێكیان بەرزترە لەهی هەندێكیان ، شەهادە ئیمانە و بەرزترە لەنوێژ و بەم شێوەیە ، وە ئیمانداران دەبنە چەند پلەیەك ، پلەی پێغەمبەران بەرزترینە ، وە ئەبوبەكر ( الله لێی ڕازی بێت ) باشترینی ئوممەتی محمدە ( صلى الله عليه وسلم ) و بەم شێوەیە ، وە صحابەكان ( الله لێیان ڕازی بێت ) پلەیان بەرزترە لەتابعینەكان ، وە بەم شێوەیە .
بۆیە نووسەر ـ لەوكاتەی باسی ئیمان دەكات ـ وتوویەتی: **ئیمان دەبێتە چەند پلەیەك و ئیماندارانیش پلەوپایەیان جیاوازە .**

## بەشێك: ئیمان هێنان بەنادیارەكان ( المغیبات )

**نوسەر فەرموویەتی**: واجبە ئیمان هێنان بەهەموو ئەو شتانەی كە پێغەمبەری الله ( صلى الله علیە وسلم ) هەواڵی پێداوە لەبارەیان وە بەدروستی لێیەوە گەیێنراوە لەوەی بینیومانە یاخود لێمانەوە دیار نەبێت دەزانین كە هەقە و ڕاستی فەرمووە ، جا ئەگەر لەوشتانە بێت كە عەقڵمان دركی پێ ناكات یاخود نەزانین بەرامبەری و ئەگەر نەگەیشتین بەهەقیقەتی واتاكەی ، وەكو فەرموودەكەی الاسراء والمعراج كە بە هەستاوی بووە و لەخەودا نەبووە ، چونكە قوڕەیش ئینكاری لەوە كرد و بەگەورەیان دانا وە ئینكاریان لە خەوبینین نەكرد و لەوانەش كە فریشتەی گیان كێشان كاتێك كە هاتە لای موسى علیە السلام تاوەك گیانی بكێشێت ، موسى زلەیەكی لەڕوومەتی فریشتەی گیان كێشان دا و چاوی تەقاند و گەڕایەوە بۆ لای الله و چاوەكانی بۆ گەڕاندەوە .

لەوانەش نیشانەكانی هاتنی قیامەت ( ڕۆژیی دوایی ) وەك دەركەوتنی دەجال و دابەزینی عیسى كوڕی مریم علیە السلام كە دەیكوژێت ، وە دەركەوتنی یەئجوج و مەئجوج وە دەركەوتنی گیاندارە مەزنەكە و هەڵهاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاوایەوە و هاوشێوەی ئەو شتانە كە بەدروستی هاتوون .

وە سزای گۆڕ و نیعمەتەكانی هەقە و پێغەمبەری الله ( صلى الله علیە وسلم ) پەنای گرتووە بە الله لێی وە فەرمانی كردووە بە گوتنی لەهەموو نوێژێكدا .

وە فتنەی گۆڕ هەقە و پرسیاری مونكەر و نەكیر هەقە وە زیندووبونەوەی دوای مردن هەقە ئەوەش كاتێك كە إسرافیل علیە السلام فوو لە صور ئەدات: ( **فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ** ) وە خەڵكی لەڕۆژی دواییدا بەڕووتی و پێخواسی و خەتەنەنەكراوی حەشر دەكرێن ، لەوەستانی قیامەت ئەوەستن تاوەكو پێغەمبەرەكەمان ( صلى الله علیە وسلم ) شەفاعەتیان بۆ ئەكات وە الله تعالى لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەكات و تەرازووەكانی كێشانی كردەوەكان دادەنرێن و نوسراوەكان بڵاودەكرێنەوە وە نامەی كردەوەكان دەدرێنەوە بەدەستی ڕاست و چەپی مرۆڤەكاندا ( **فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ * فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا * وَيَنقَلِبُ إِلَىٰ أَهْلِهِ مَسْرُورًا * وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ**

**كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ * فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُورًا * وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا** ) وە تەرازووی کێشانی کردەوەکان دوو مستی هەیە و زمانێك کە کردەوەکانی پێ دەکێشرێت: ( **فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ * وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَٰئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ** ) وە بۆ پێغەمبەرەکەمان محمد ( صلی الله علیه وسلم ) حەوزێك هەیە ئاوەکەی زۆر سپی ترە لەپەنیر و شیرین ترە لەهەنگوین وە درەوشاوەکەی هێندەی ئەستێرەکانی ئاسمانن ئەوەی لێی بخواتەوە دوای ئەوە تینۆی نابێتەوە ، وە پردی صراط هەقە و چاکەکاران تێپەڕدەبن بەسەریدا و خراپەکاران دەکەون لەسەریدا ( لەسەری دەکەونە خوارەوە ) .

وە پێغەمبەرمان ( صلی الله علیه وسلم ) شەفاعەت بۆ ئەو کەسانە دەکات لەئومەتەکەی کە چوونەتە ناو ئاگرەوە بەهۆی تاوانە گەورەکانەوە و دەردەچن لەدۆزەخ بەشەفاعەتی ئەو دوای ئەوەی کە سووتاون و بوونە بەپۆلا و خەلوز و دەچنە بەهەشتەوە وە بۆ هەموو پێغەمبەران و ئیمانداران و مەلائیکەتەکان شەفاعەت هەیە ، الله تعالی فەرموویەتی: ( **وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ** ) وە شەفاعەتی شەفاعەتکاران هیچ سود بەکافران نایەگەیێنێت .

وە بەهەشت و دۆزەخ دوو دروستکراون کۆتاییان پێ نایێت و لەناوناچن ، بەهەشت جێگەی دۆستانیەتی و دۆزەخیش سزای دوژمنانیەتی وە ئەهلی بەهەشت تا هەتایی لەناویدا دەمێننەوە: ( **إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ * لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ** ) .

وە مردن دەهێندرێت لەسەر شێوەی سەربڕینی بەرانێك و سەردەبڕدرێت لەنێوان بەهەشت و ئاگر ( دۆزەخ ) دا ، پاشان دەگوترێت: ( ئەی ئەهلی بەهەشت بمێننەوە تیایدا و مردن نییە و ئەی ئەهلی دۆزەخ بمێننەوە تیایدا و مردن نییە ) .

## ڕوونکردنەوە :

بەڵام سەبارەت بەوەی بۆچی نوسەر ئەو بەشەی گرێداوە بەبەشی نادیارەکان ؟ چونکە ئیمانی تێدا پێویستیە وە نوسەر قسەی لەسەرداوە کاتێك فەرمووی: واجبە ئیمان هێنان

بەهەمـوو ئەو شـتانەی کـەوا پێغەمـبەری الله ( صـلی الله علیـه وسـلم ) ڕایگەیانـدووە لەبارەیـان ، دواتـر نوسـەر باسـی حـوکمی ئیمـان هێنـان بەشـتە نادیارەکـان کـردووە کە واجبە ، وە ئەوەش بریتییە لەبنچینەیەك لەبنچینەکانی ئەهلی سوننە و جەماعە .
پاشان نوسەر باسی ڕادەی واجبێتیەکەی کردووە بەپێی چەندێتی ، فەرمووی ( بەهەموو ئەو شـتانەی کە هەواڵـی پێـداوە ) دەبێـت و پێویسـتە ئیمـان هێنـان بەهەمـوو شـتە نادیارەکان گشتیان ، بەڵام لەڕووی گشتیەوە ( لەڕووی تەواوی شتە نادیارەکان ) ، جا ئەگەر واز لەیەك دانەیان بهێنێت ئەوا لەدین دەردەچێت .

**وە نوسەر دوو مەرجی دارشتووە بۆ ئەو بنچینەیە :**

**یەکەم**: بەوەی ئەو هەواڵە نادیارانە هاتبێت لەلایەنی شەرعەوە ، بۆیە فەرمووی: بەهەموو ئەو شـتانەی کە پێغەمـبەری الله ( صـلی الله علیـه وسـلم ) هەواڵـی داوە لەبارەیـان ، وە مەبەسـتی لەوەی پێغەمـبەری الله ( صـلی الله علیـه وسـلم ) ڕایگەیانـدبێت ئەوەی کە لەلایەنـی قـورئانەوە هـاتووە - ئەمەشـیان جـۆرێکە - یـاخود لەلایەنـی سـوننەتەوە - ئەمەشـیان جۆرێـك - یـاخود هـاوەڵان هەواڵیـان دابێـت لەبـارەیەوە ، لەو شـتانەی کە مەجـالی ڕا و بۆچـوونی تیـا نییە ، بەڵام شـتە نادیارەکـان کە لەلایەنـی ئەقـڵ و پزیشـکی سـەردەمەوە دێـت ، نوسـەر مەبەسـتی لەوە نییە وە حـوکمیش پەیوەنـدی پێـوە نییە ، وە هەنـدێك شـتی نادیـار هەن کە پزیشـکی سـەردەم دەیسـەلمێنێت بـۆ نمـوونە ، ئەوەیـان پێویسـت ناکـات کە خەلکـی ئیمـانی پـێ بهێـنن ، وە لەبنچینەکـانیش نـییە وەك خـانە سوورەکانی خوێن و سپییەکان و زەردی دڵ .

**دووەم**: دروستە بەمە ئەو هەواڵە لەقورئاندا هاتبێت - کە ئەوەیان صحیح و دروستە - وە ئەگەر لەڕێگـای سـوننەتەوە هاتبێـت ئەوا مەرج تیایـدا ئەوەیە کە فەرمـوودەکە صـحیح بێت .
وە نوسـەر سودی داوە لەبارەی ئەوەی کە مەرج نییە بۆ نادیارەکان کە بتوانرێت عەقل درکـی پـێ بکـات و پێویسـتە کە واتـای دیـار بێـت وە لەسـنوری شـتێکی مەعقـول بێـت ،

ئەوەیـان مەرج نییە جگە لای ئەهلی بیدعەچییەکان و سەردەمیەکانەوە نەبێت ، هەر بۆیە نوسەر فەرموو : (**جا ئەگەر لەو شتانە بێت کە عەقڵمان درکی پێ ناکات یاخود نەزانین بەرامبەری و ئەگەر نەگەیشتین بەهەقیقەتی واتاکەی** ) .

**پرسیار: ئایا مەرج وایە کە لەفەرموودەی متواتر بێت و ئەگەر لەڕێگای ئاحادەوە هاتبێت قبوڵ ناکرێت ؟**

وەڵام: بەڵام لای ئەهلی بیدعە ئەوانە فەرموودەی ئاحاد قبوڵ ناکەن لەبیروباوەڕدا بەڵکو پێویستی بەفەرموودەی متواترە ، وە مەزهەبی سەلەف ئەوەیە کە فەرموودەی ئاحاد بەسە ئەگەر صحیح بێت .

پاشان نوسەر ئەوەی داواکراوە و پێویستە لەبەرامبەر نادیارەکانی باسکردووە ، وە وەڵامیش ئەوەیە کە داواکراو و پێویستە بریتییە لەئیمان هێنان بەشتە نادیارەکان لەگەڵ بەڕاستدانانی ، بۆیە نوسەر فەرموویەتی: دەزانین ئەوەش هەقە و ڕاستی فەرمووە .

**پرسێك**: ئایا چۆنیەتی ئیمان هێنان بە شتە نادیارەکان چۆنە ، ئایا بەتەنها واجبە ، وە ئایا پێویست دەکات بە جیا و بەهەموو لایەنەکانیەوە ئیمانی پێ بهێنین یاخود ئێمان هێنان بەگشتی پێی بەسە ؟

**وەلام**: ئیمان هێنان پێی بەگشتیەکەی بەسە و کافیە ، بەسە بەوەی ئیمان بهێنیت بە مەلائیکەتەکانی و بەڕۆژی دوایی بەشێوەیەکی گشتی.....تا کۆتایی .

بەڵام بەشێوەی ووردەکاری و لایەنەکانیەوە ئەوا فەرزی کفایەتە ، کەوا پێویستە لەسەر زانایان و گەورەیانی دین کە وردەکاری شتە نادیارەکان بزانن ، ژمارەی مەلائیکەتەکان بزانن لەوانەی کە باسکراون وە پیشەی جوبریل و میکائیل ، وە جۆرەکانی مەلائیکەتەکان و صیفەتەکانیان بەشێوەیەکی ڕوون و ورد ، وە بەهەمان شێوە ڕۆژی دوایی وە تەرازووەکان و لێپرسینەوە وە لێپرسینەوەی قیامەت چۆن دەبێت بەشێوەیەکی دەقیق و وردەکارییەکانی و بەشەکانی .

پاشان نوسەر چەند نمونەیەکی هێناوەتەوە لەسەر نادیارەکان کە واجبە ئیمان هێنان پێی ، وە بۆ کەمکردنەوەی بەوەندە نەیهێناوەتەوە **بەڵکو بۆ نموونە هێناویەتیەوە ئەویش بەو شێوەیەیە :**

1_ لەنموونەی الاسراء والمعراج دەستی پێکردووە کەواجبە ئیمان هێنان پێی کەبەهەڵساوی بوو نەك لە خەو ، وە بەهەمان شێوە ئیمان هێنان بەوەی بووە و ڕوویداوە لە شەوی الاسراء والمعراج دا بەگشتی بۆ هەموو خەڵکی وە بەوردەکارییەوە لەسەر زانایان .

2_ چیرۆکی موسی علیه السلام لەگەڵ فریشتەی گیان کێشان ، ئەوەیان لەشتە نادیارەکانە کە بەدروستیەوە نەقڵ کراوە بۆیە واجبە ئیمان هێنان پێی ، وە نوسەر بەگشتی باسی چیرۆکی موسی ی هێناوەتەوە لەگەڵ فریشتەی گیان کێشان ، لەبارەی چیرۆکەکەوە فەرموویەتی: کە فریشتەی گیان کێشان کاتێك کە هاتە لای موسی علیه السلام تاوەك گیانی بکێشێت ، لەڕوومەتی دا و چاوی شەق کرد ، وە ئەو چیرۆکەش جێگیربووە لە دوو پەرتووکە صحیحەکەدا ( بوخاری و موسلم ) وە موعتەزیلە هەر لەکۆنەوە ئینکاریان لێکرد و سەردەمیەکانیش بەهەمان شێوە ئینکاریان لێکرد وە باسکردنی دێت ، وە مەبەستیش ئەوە نییە کە وردەکارییەکانی ئەو چیرۆکە فراوان بکرێت ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە لە شتە نادیارەکانە کە ئیمان هێنان پێی واجبە .

3_ ئیمان هێنان بە نیشانەکانی هاتنی قیامەت ( ڕۆژی دوایی ) ئەوەشیان لە نادیارەکانی سێهەمە ، کە ئیمان هێنان پێی واجبە جا ئەگەر نیشانە بچوکەکان بێت یان گەورەکان ، وە نوسەر باسی پێنج نیشانەی هاتنی قیامەتی کردووە و مەبەستی لە کەمکردنەوەی بەوەندە نەبووە ، باسی دەجالی کردووە ، دواتر عیسی علیه الصلاة والسلام ، دواتر یەئجوج و مەئجوج ، دواتر گیاندارە مەزنەکە ، دواتر هەڵهاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە ، دواتر نوسەر فەرمووی هاوشێوەی ئەمانەش ، وە مەبەستی لە پوخت کەم کردنەوەی نەبووە

بەوەندە ، ئەوە هاتنی مەهدیە بۆ نموونە ، کە ئەوەش یەکەم نیشانەی گەورەی هاتنی قیامەتە ، وە کۆتاییەکەی نیشانەکانی ئاگرە کە خەڵکی ڕادەکێشێت بۆ حەشر .

4_ دواتر باسی سزای گۆڕ و ئەوەی پەیوەندی پێوە هەیە کردووە و ئەوەش شتێکی شاراوەیە واجبە ئیمان هێنان پێی ، **وە باسەکانی گۆڕ سێن ، هەمووی دراوەتە پاڵ گۆڕ :**
أ_ نیعمەتی گۆڕ ئەوەش بۆ ئیماندارانە .
ب_ سزای ناو گۆڕ ئەوەش بەگشتی بۆ کافرانە وە لەوانەیە هەندێك لە تاوانکارانیش توشی ببن لەو کەسانەی کە الله ویستی لەسەرە سزایان بدات .
ج_ ئاشووبەی ( فتنە ) گۆڕ لەفتنەکانی ناو گۆڕیش پسیارکردنی مونکەر و نەکیرە .

5_ ئەوەی کە پەیوەستە بەڕۆژی دواییەوە (قیامەت) ، نوسەر سەرەتا بەزیندووبونەوە دەستی پێکردووە تاوەك چوونی ئەهلی بەهەشت بۆ ناو بەهەشت و ئەهلی دۆزەخیش بۆ ناو دۆزەخ ، وە باسی ڕووداوەکانی ڕۆژی دوایی کردووە فوکردنی إسرافیل بەصوردا و باسی حەشریشی کردووە ، وە ئەو لەیەك بڕگەدا کۆیانی کردۆتەوە ، دواتر وەستان دوای ئەوەی حەشر دەکرێن و کۆدەبنەوە و بۆ ماوەیەکی درێژ ڕادەوەستن ، دواتر ڕووداوەکانی شەفاعەت و بەوەی کە بێزار دەبن لەو ماوە درێژەی ڕادەوەستن ، بۆیە شەفاعەت بەپێغەمبەران دەکەن تاوەك پێغەمبەری الله علیه الصلاة والسلام شەفاعەت دەکات ، دواتر لێپرسینەوە دەست پێدەکات الله تعالى خۆی دێت بۆ لێپرسینەوە ، دواتر دانانی تەرازووەکان و بڵاوکردنەوەی نوسراوەکان ، دواتر حەوزی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ، وە دوای لێپرسینەوە وەرگرتنی نامەی کردەوەکان ، دواتر پردی صیراط و دواتر چوونی ئەهلی بەهەشت بۆ ناو بەهەشت و ئەهلی دۆزەخ بۆ ناو دۆزەخ ، دواتر دوای ئەوە شەفاعەتی پێغەمبەر و شەفاعەتی تەنها الله پەرستان .
پاشان لەنادیارەکاندا باسی سەربڕینی مردنی کردووە ، فەرمووی : ( **مردن دەهێندرێت لەسەر شێوەی سەربڕینی بەرانێك و سەردەبڕدرێت لەنێوان بەهەشت و ئاگر ( دۆزەخ ) دا ........ تا کۆتایی فەرموودەکە** ) .

ئەوەیان ئەوەی کە پەیوەستە بەڕووداوەکانی قیامەتەوە ، دواتر ئەوانەی لەبەهەشتن تیایدا دەمێنەوە بۆ هەتاهەتایە و کۆتایی پێ نایەت ، وە ئەوانەشی کە لەئاگر ( دۆزەخ ) دان تیایدا دەمێننەوە تا هەتایە و کۆتایی پێ نایەت .
ئەوانەش هەمووی واجبە بەگشتی ئیمان هێنان پێی بۆ کۆمەڵەیەك و بەوردەکاری و بەشەکانییەوە بۆ کۆمەڵەیەکیتر ، وە ئیمان بەنادیارەکان لەبنچینەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە ، وە سەردەمیەکان پێچەوانەی ئەوەیان کرد ، وە ئینکاریان لەو بنچینەیە کرد وە ئینکاریان لەموعجیزەکان و نادیارەکان کرد و ئیمانیان نەهێنا پێی تەنها بەشتە ماددیەکان و ڕوونەکان نەبێت ، وە خاوەنی کتێبی ( العصرانیون بین مزاعم التجدید ) دانەری " محمد الناصر " باسی مەنهەجی سەردەمییەکانی کردووە ، وە هەڵوێستیان لەسەر موعجیزەکان و شتە نادیارەکان .

بەڵام سەبارەت بەموعجیزەکانی قیامەت تەفسیری دەکەن بەشانۆگەری و وێنەگرتن ، هەڵگرتنی عەرش وێنەیەکە بۆ تەواویەتی گەورەیی ، وە وەرگرتنی پەرتووکەکان ( نامەی کردەوەکان ) بەدەستی چەپ و ڕاست لەلایەنی شانۆگەری و وێنەگرتن ، وە واتای ڕاست بریتییە لە دڵخۆشی ، وە بەهەمان شێوە گومانیان دروست کرد لەسەر موعجیزەی لەت بوونی مانگ لەسەردەمی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) وە بەهەمان شێوە موعجیزەی زیادبوونی خواردن لە تەبوك و خەندەقدا ، وە جنەکان بەجۆرێکی میکرۆباتە شاراوەکان سەیر دەکەن ، وە هەندێکیان میکرۆبەکانیان کردووەتە جۆرێك لەجن ، وە پشتیان بەستووە بە فەرموودەی طاعون و دەستلێدانی جن ، لەسەر ئەوەی کە جن میکرۆباتێکە دەبێتە هۆکاری نەخۆشی طاعون ، وە هەندێکیان فەرموودەی: ( شەیطان وەك خوێن هاتوچۆ دەکات بەناو لاشەی نەوەی ئادەمدا ) [120] تەئویل کرد بەوەی کە میکرۆباتە هاتوچۆ دەکات لە ڕێگەی لەشی مرۆڤەوە ، بەهەمان شێوە ئەو فەرموودانەیان ڕەتکردۆتەوە کە شتێك لە نادیارەکانی تێدایە ، وە فەرموودەی دابەزینی عیسی علیه السلام ، وە فەرموودەی دەجال و جەساسە ، وە ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەری الله

(120) رواه البخاري في صحيحه 717/2 (ح1934), ومسلم في صحيحه 1712/4 (ح2174) .

( صلى الله عليه وسلم ) جادووی لێکرا وە فەرموودەی إسراء و میعراج ، وە فەرموودەی بەربوونەوەی مێش بۆ ناو دەفری خواردنەوە ، وە ئینکاریان کرد لەفەرموودەی: ( کەسی واتان هەیە کار و کردەوەی بەهەشتیی دەکات هەتا لەنێوان ئەو و بەهەشتدا ئەندازەی گەزێکی دەمێنێ......) [121] ، وە ئینکاریان کرد لەفەرموودەکەی چیرۆکی موسی لەگەڵ فریشتەی گیان کێشان ، وە فەرموودەی ئیسلام بوونی شەیطانی پێغەمبەر ( صلى الله علیه وسلم ) ، وە هاوشێوەی ئەوانە .

ئەوانەش زۆربەیان قوتابی محمد عەبدەی عەلمانین ، هەرەشەترینیان ئەوەیە کە نابراوە بەمحمود أبورية ، وە احمد أمین و ڕەشید رضا ماوەیەك لەماوەکانی ژیانی مەنهەجێکی هەبوو لە ئینکاری کردنی نادیارەکان ، بەڵام لەکۆتایی ژیانیدا گەڕایەوە بۆ سەر مەنهەجی سەلەف ، وە ئەو قوتابخانەیە - قوتابخانەی سەردەمییەکان - بەپێچەوانەی سەلەف دادەنرێت لەو بنچینەیەدا کە بریتییە لەدانپێدانان بەنادیارەکان و مەنهەجێکی بێدینیان داڕشتووە لەو باسە ، وە تاوەکو ئێستا ئەو قوتابخانەیە هەیە وە فراوانی بەخۆیەوە بینیوە لەکاتی ئێستاماندا ، لە ساڵەکانی دواییدا لەکەندا و جەزیرە ( جەزیرەی عەرەب ) دەرکەوتن ، ئێستاش بەقۆناغی هاوپەیمانیەتی لەگەڵ دەسەڵاتدارە عەلمانییەکان تێپەڕدەبن ، الله هەموویان بکوژێت ، وە قۆناغی دۆزینەوەی جولەیەکی فکری نەتەوەیی بۆیان لەناوەوەی جەزیرە ( جەزیرەی عەرەب ) و ڕۆژنامە و و پێگەی خۆیان هەیە لەئینتەرنێت و یانە و شوێنی خراپەکاری خۆیان هەیە ، الله ڕوویان ڕەشکات .

(121) أخرجه البخاري في صحيحه 2433/3 (ح6221), ومسلم في صحيحه 2036/4 (ح2643) .

## بەشێك

### نوسەر فەرموویەتی :

وە محمد پێغەمبەری الله یە ( صلی الله علیە وسلم ) و دواهەمینی پێغەمبەرانە و گەورەی نێردراوانە و ئیمانی هیچ بەندەیەك دروست نابێت تاوەك ئیمان نەهێنێت بەپەیامەکەی و شایەدی نەدات بەپێغەمبەرایەتیەکەی وە هیچ کەسێك شەفاعەت نادرێت لەقیامەتدا تەنیا بە شەفاعەتی ئەو نەبێت ، وە هیچ ئومەتێك ناچێتە بەهەشتەوە ئیللا دوای چوونی ئومەتەکی ئەو نەبێت بۆ بەهەشت .

خاوەنی لیوای سوپاس و مەقامی مەحمود و حەوزی مەوروده وە ئەویش پێشەوای پێغەمبەرانە و خەطیب و خاوەنی شەفاعەتیانە ، ئومەتەکەی چاکترینی ئوممەتانە وە هاوەڵانی چاکترینی هاوەڵانی پێغەمبەرانن علیهم السلام .

وە چاکترینی ئوممەتەکەی ئەبوبەکری ڕاستگۆیە دواتر عومەری فاروقە دواتر عوسمانی خاوەن دوو نور ، دواتر علی ڕەزامەند ڕەزامەندی الله تعالی بەتێکڕا لەسەریان ، کاتێك کە عبدالله بن عمر ( الله لێیان ڕازی بێت ) دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: ئێمە کە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیە وسلم ) زیندووبوو دەمانگوت چاکترینی ئەو ئومەتە دوای پێغەمبەرەکەی ئەبوبەکرە دوای ئەو عومەر دوای ئەو عوسمان دوای ئەو علی و ئەوە دەگەیێنرا بەپێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) و ئینکاری لێ نەدەکرد .

وە بەدروستی گێڕدراوەتەوە لە علی ـەوە ( الله لێی ڕازی بێت ) کەوا فەرموویەتی: (چاکترینی ئەو ئوممەتە دوای پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) ئەبوبەکرە دوای ئەو عومەر و ئەگەر بم ویستبایە ئەوا بەسێیەم ناودەبرام ) .

وە ئەبو درداء دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری الله ـەوە ( صلی الله علیە وسلم ) کەوا فەرموویەتی: ( **نە ڕۆژ هەڵهاتووە و نە ئاوابووە لەدوای پێغەمبەران و نێردراوان لە ئەبوبەکر چاکتر و باشتر** ) .

وه ئەو هەقترین بەندەی الله یە بۆ جینێشینی ( خیلافەت ) لە دوای پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم) وە بەهۆی فەزڵی و پێشخستنی بۆ نوێژ دابەستن لەسەر هەموو هاوەڵانەوە لەلایەن پێغەمبەری الله وە ( صلی الله علیه وسلم ) ، وە کۆدەنگی هاوەڵان الله لێیان ڕازی بێت لەسەر پێشخستنی و بەیعەت پێدانی ، وە نەدەبوو الله لەسەر گومڕایی کۆیان بکاتەوە پاشان دوای ئەو عمر دێت ( الله لێی ڕازی بێت ) بەهۆی فەزڵی و پەیمانی ئەبوبەکر بۆی ، دواتر عوسمان ( الله لێی ڕازی بێت ) بەهۆێ پێشخستنی لەلایەن ئەهلی ڕاوێژەوە ، دواتر علی ( الله لێی ڕازی بێت ) بەهۆی فەزڵی و کۆدەنگی خەڵکی سەردەمی خۆی لەسەری .

ئەوانەش خەلیفە ( جێنشینە ) ڕێپیشاندەر و ڕێنمایکراوەکانن ئەوانەی کەوا پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) لەبارەیان فەرموویەتی: ( **پەیوەست بن بەسوننەتی من و سوننەتی جێنشینە ڕێپیشاندەر و ڕێنمایکراوەکانی دوای من ، بە کاکیلەکانتان بیگرن** ) .

وە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی: ( **جێنیشینیایەتی لەدوای من سی ساڵە** ) جا کۆتاییەکەی خیلافەتەکەی علی بوو ( الله لێی ڕازی بێت ) .

وە شایەدی بەهەشت دەدەین بۆ دە ( 10 ) مژدەپێدراوەکە هەروەکو چۆن پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) شایەدی بۆ داون وە فەرموویەتی : ( **ئەبوبەکر لەبەهەشتە وە عومەر لەبەهەشتە و عوسمان لەبەهشتە و علی لەبەهەشتە و طلحة لەبەهەشتە و زوبەیر لەبەهەشتە و سعد لەبەهەشتە و سعید لەبەهەشتە و عبدالرحمن کوڕی عەوف لەبەهەشتە و أبو عبیدةی کوڕی جراح لەبەهەشتە** ) .

وە هەر کەسێك کە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) شایەدی بۆ بدات ئیمەش شایەدی بۆ دەدەین وەك وتەی: ( **حەسەن و حسێن پێشەوای گەنجانی ئەهلی بەهەشتن** ) وە وەك وتەکەی بۆ ثابتی کوڕی قیس: ( **ئەو لەئەهلی بەهەشتە** ) .

## ڕوونكردنەوە :

لەو بەشەدا نوسەر باس لەتایبەتمەندی و صیفەتەكانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەكات ، پاشان وەك پاشكۆیەك بۆ ئەوە باسی لەفەزڵەكانی ئوممەتی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەكات ، پاشان وەك پاشكۆیەك بۆ ئەوە باسی فەزڵەكانی هەندێك لەتاك تاكی ئەو ئوممەتەی كردووە ، وە لەسەر ئەوەش باسەكە دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:

_ بەشێك لەسەر فەزڵەكانی پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) .
_ بەشێك لەسەر فەزڵەكانی ئوممەتی محمد (صلى الله عليه وسلم) بەشێوەیەكی گشتی .
_ بەشێك لەسەر فەزڵەكانی تاك تاكی ئەو ئومەتە .

بەڵام بەشی یەكەم: تایبەتە بە صیفەتەكانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) و فەزلەكانی ، نوسەر لەبارەیەوە فەرموویەتی: ( **وە محمد نێردراوی الله یە ( صلى الله عليه وسلم ) و دواهەمینی پێغەمبەرانە و گەورەی نێردراوانە ئیمانی هیچ بەندەیەك دروست نابێت هەتاوەك ئیمان نەهێنێت بەپەیامەكەی و شایەدی نەدات بەپێغەمبەرایەتییەكەی وە هیچ كەسێك شەفاعەت نادرێت لە قیامەتدا تەنیا بەشەفاعەتی ئەو نەبێت ، وە هیچ ئومەتێك ناچێتە بەهەشتەوە ئیللا دوای چوونی ئومەتەكەی ئەو نەبێت بۆ بەهەشت ، خاوەنی لیوای سوپاس و مەقامی مەحمود و حەوزی مەورود و ئەویش پێشەوای پێغەمبەرانە و ئیمام و خاوەنی شەفاعەتیانە ، ئومەتەكەی چاكترینی ئوممەتانە وە هاوەڵانی چاكترینی هاوەڵانی پێغەمبەرانن عليهم السلام** ) .

ئەویش بەو شێوەیەیە :

1_ نوسەر باسی صیفەتێك لە صیفەتەكانی پێغەمبەری كردووە (صلى الله عليه وسلم) و فەرمووی ( **نێردراوی الله** ) وە پێش ئەوەی وە صفی بكات بەوەی پەیامبەرە باسی ناوی كردووە كە ناوی محمدە ، ئەوەش لەبەناوبانگترین ناوەكانی پێغەمبەرە ( صلى الله عليه وسلم )، الله تعالى فەرموویەتی: ( **مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ** ) [122] ، وە لە قورئاندا هاتووە كە

(122) سورة الفتح: 29 .

ناوی براوە بە أحمد ، الله تعالى فەرموویەتی: ( **وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ**) [123] ، وە ناوەکانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) زۆر هاتووە لە سونئەتدا .

2_ دواتر باسی صیفەتێکی تری کردووە بۆ پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) و فەرمووی : ( **دواهەمینی پێغەمبەران** ) وە واتای دواهەمینی پێغەمبەران واتە کۆتایەمین پێغەمبەر لەدوای ئەو هیچ پێغەمبەرێك نییە ، بەڵام دابەزینی عیسی لەپێش کۆتاییهاتنی دونیا لەسەردەمی مەهدی واتای ئەوە نییە کە عیسی بابەتی تەواوکەری پەیام و پێغەمبەرایەتی محمد ( صلى الله عليه وسلم ) هەڵدەوەشێنێتەوە .

3_ دواتر باسی صیفەتێکی لەصیفەتەکانی پێغەمبەری کردووە ( صلى الله عليه وسلم ) و کە لەهەمانکاتدا فەزڵەکانیەتی ، وە فەرمووی: ( **گەورەی نێردراوان** ) وەصفکردنی بە گەورە و سیادەت ، واتای شەرەف ئەدات و بەوەی کە پێشەوایانە و گەورەیانە ، وە سیادەتی ( گەورەیی ) لێرەدا بەستۆتەوە فەرمووی ( **گەورەی نێردراوان** ) وە گەورایەتی ئەگەر بەسترایەوە ئەوا دروستە دەربڕینی ، دەگوترێت: ( **گەورەی نێردراوان** ) ، وە (**گەورەی نەوەی ئادەم** ) ، وە ( **گەورەی ئەنصار** ) ، وە هاتووە لە فەرموودەدا لای ئەبو داود لە وتەی پێغەمبەر علیه السلام: ( گەورە الله یە ) [124] ، واتە لە لایەنی تەواویەتی و ئەوپەڕیەوە .

4_ دواتر باسی صیفەتێك لە صیفەتەکانی پێغەمبەری کردووە ( صلى الله عليه وسلم ) کە ئەویش لە فەزلەکانی و تایبەتمەندیەکانیەتی ئەویش ئەوەیە کە ئەو خاوەنی شەفاعەتە گەورەکەیە ، وە جارێکی تر باسی کردۆتەوە ، فەرمووی خاوەنی مەقامی مەحمود ، کە مەبەستی لێ شەفاعەتە گەورەکەیە .

5_ دواتر وەصفی کردووە بەوەی خاوەنی لیوای سوپاس گوزاریە مەبەستیشی لەوە ئەوەیە کە سوپاسی الله دەکات بەشێوەیەکی زۆر گەورە پێش ئەوەی کە ڕێگای پێ بدرێت بۆ شەفاعەتە گەورەکە .

(123) سورة الصف: 6 .

(124) أخرجه أبو داود في سننه 254/4 (ح4806), وأحمد في مسنده 24/4 (ح16350) .

6ـ وه دواتــر وه‌صــفی کــردووه به‌وه‌ی خــاوه‌نی حه‌وزه و ئه‌وه‌ش له تایبه‌تمه‌نــدیه‌کانی پێغه‌مــبه‌ر نیــیه ( صــلى الله علیــه وســلم ) به‌ڵکــو یه‌کــێکه له‌صــیفه‌ته‌کانی ، هه‌مــوو پێغه‌مبه‌رێك حه‌وزێکی هه‌یــه ، به‌ڵام حــه‌وزی پێغه‌مبــه‌ر علیه السلام گه‌وره‌تریــن و شه‌ره‌فمه‌ندترینیانــه ، وه وتــه‌ی ( **موورود** ) واته ئیماندارانی ئه‌و ئومه‌ته ده‌گه‌ن پێی ، وه کاتی گه‌شتنه‌که‌ش له‌کاتی شوێنی قیامه‌ته له شوێنی ڕاوه‌ستان و حه‌شردا .

7ـ دواتر فه‌رمووی: ( **پێشه‌وای پێغه‌مبه‌ران** ) و پێغه‌مبه‌ری الله ئیمامه‌تی کرد بۆیان له شه‌وی إسراء و میعراجدا .

8ـ وه له‌و صیفاتانه‌ی که له‌تایبه‌تمه‌ندیه‌کانیه‌تی فه‌رمووی: خه‌طیبیانه ( **و خطیبهم** ) و ضمیري ( هم ) ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ پێغه‌مبه‌ران علیهم السلام .

ئه‌وه هه‌نـدێك له‌صیفه‌ته‌کانی پێغه‌مبه‌ر ( صلى الله علیـه وسـلم ) ، هه‌نـدێکیان تـایبه‌ته به‌خۆی ، وه هه‌ندێکی تریش به‌شداری جگه له‌خۆی پێکردووه ، وه نوسـه‌ر مه‌به‌ستی له که‌مکردنه‌وه نه‌بووه ، ئه‌گه‌رنا تایبه‌تمه‌ندیه‌کانی پێغه‌مبه‌ر ( صلى الله علیه وسلم ) زۆره .

**پرسێك :**

دواتر نوسـه‌ر باسی حوکمی ئه‌وه‌ی کردووه که ئیمانی پێ نه‌هێنێت ، فه‌رمووی: ( **ئیمانی هیچ به‌نده‌یه‌ك دروست نابێت تاوه‌ك ئیمان نه‌هێنێت به په‌یامه‌که‌ی و شایه‌دی نه‌دات به پێغه‌مبه‌رایه‌تیه‌که‌ی** ) .

وه وته‌که‌ی ئیمـانی کـه ده‌ڵێت دروسـت نابێت ( لا یصح ) ئه‌و ( لا ) یه ( لا نافیـة یـه ) ، نه‌فی دروستیه‌تی ده‌کات ، له‌سه‌ر ئه‌وه‌ش ئه‌وه‌ی ئیمان به په‌یامه‌که‌ی نه‌هێنێت کافره .

**پرسێك: واتای ئیمان هێنان به په‌یامه‌که‌ی :**

واتـای ئه‌وه‌یه که ئیمـان بریتییه له وته و کرده‌وه و بیروباوه‌ڕ ، ئه‌مه واتـای ئیمـان هێنـان به‌په‌یامه‌که‌یه‌تی ، وه واتـای ( وته ـ قول ) واته شایه‌دی بدات به په‌یامه‌که‌ی ، وه واتـای بیروباوه‌ڕی دڵ بریتییه له‌وه‌ی له‌دڵیدا زانستی هه‌بێت به په‌یامه‌که‌ی پێغه‌مبه‌ر ( صلى الله علیه وسلم ) و به‌ڕاستدانانی به‌وه ، **وه مه‌به‌ستیش له کرده‌وه دوو شته :**

أ_ **كردەوەی دڵ ( عمل القلب )** : بریتییە لەخۆشویستنی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم ) و یەقین هەبوون پێی و بەڕاستدانانی و ئیخلاص و ڕەزامەندبوون بەپەیامەکەی .
ب_ **کردەوەی ئەندامەکانی لاشە ( عمل الجوارح )** بریتیە لەملکەچ بوون بۆ فەرمانەکانی پێغەمبەر ( صلى الله علیە وسلم ) و کردنی بەئەندامەکانی لاشە ، وە گوێڕایەلیکردنی بەوە ، وە ئەوەشیان بەشێکە لە وتەی سەلەف سەبارەت بە ئیمان .

**بەڵام مەزهەبی خەڵکی سەبارەت بە ئیمان هێنان بە پەیامەکەی پێغەمبەر ، بەو شێوەیە :**
1_ **کەڕامییەکان**: لای ئەوانە شایەدیدان هەیە بەپەیامەکەی پێغەمبەر (صلى الله علیە وسلم )، کە تەنها دەربڕینیەتی بەوتەیە ، ئەوەی بە زمانی بلێت: اشهد ان محمدا رسول الله ، ئەوا لای ئەوان ئیمانداره بەتەواوەتی ئیمانی هێناوە بە پەیامەکە .
2_ **جەهمیەکان**: لای ئەوانەش ئیمان هێنان بەپەیامەکەی بریتییە تەنیا لە وتەی دڵ ، وە مەبەستیش لەوتەی دڵ زانست و ناسینە ، جا ئەوەی بزانێت کە محمد ( صلى الله علیە وسلم ) پێغەمبەری الله یە و بیناسێت ئەوا ئیماندارە و ئیمانی تەواوی هەیە بەپەیامەکەی .

3_ **ئەشعەریەکان**: ئەوانە مورجیئەن لە باسی ئیماندا ، وە لایان ئەوەیە کە ئیمان هێنان بەپەیامەکەی بریتییە لە زانستی دڵ و ناسینی ، ئەوە نەبێت کە بەڕاستدانانیشیان بۆ زیاد کردووە ، ئەوەی بزانێت بە پەیامەکەی پێغەمبەر ( صلى الله علیە وسلم ) و ناسی وە بەڕاستی دانا ئەوا ئیماندارە و ئیمانی تەواوی هەیە بەپەیامەکەی ، وە ئەشعەریەکان و جەهمیەکان شایەدیدان بەپەیامەکەی وتە ( قول ) ناکەن بەمەرج بۆ ئیمان هێنان بە پەیامەکەی .

4_ **ماتوریدیەکان**: ئەوانیش وەك ئەشعەریەکانن ئیمان هێنان بەپەیامەکەی لایان بریتییە لە بەڕاستدانانی بەدڵ و دانپێدانانی بەدڵەوە وە وتە و کردەوەکانی لاشە ناکەن بە مەرج بۆ ئیمان هێنان بەپەیامەکەی .

5_ **مـورجيئەی فقهـاء** : ڕێگـای ئیمـان هێنـان بەپەیـامەکەی لای ئەوان ، بـریتییە لە کۆکراوەی قسەی کەڕامیەکان و جەهمیەکان و ئەشعەریەکان لەگەل زیادبوون لەسەر ئەوەش ئیمـان لای ئەوان: وتنیـەتی بە زوبـان و زانسـت و ناسـین و بەڕاسـتدانانی ، وە هەندێك لە کردەوەکانی دڵ زیاد دەکەن وەك خۆشویستنی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) و بەگەورەدانانی و ڕێزگرتنی دەخەنە ناو مسمای ئیمان هێنان بەپەیامەکەی .
جا هەر کەسێك دان بنێت بەو سێیە ئەوا ( لای مورجیئەی فقهاء ) ئەو کەسە ئیماندارە بە پەیامەکەی و لایان ئیمانی تەواوی هێناوە بەپەیامەکەی ، ئەوە نەبێت کەهەندێکیان ئارامی دڵ لەگەڵ خۆشەویستی و ڕێزگرتن بۆ پێغەمبەر........هتد ، زیاد دەکەن .

6_ **خەواریجـەکان و موعتەزیلەکـان**: ئیمـان هێنـان بەپەیـامەکەی لای ئەوانە وتـە و بیروبـاوەڕی دڵ و کردەوەیـە وەك مەزهەبـی سـەلەف جـگە لەوە نەبێـت کە جیـاوازیەکە ئەوەیە کە ئەوانە هەمـوو کـردەوەیەك بەمەرج دادەنـێن بـۆ ئیمـان ، ئـەگەر مخـالەفەی پێغەمبەری کرد (صلی الله علیه وسلم ) ئەگەر بەیەك کردەوەش بێت ئەوا کافرە ، بەڵام سـەلەف دەڵـێن ئەوەی مخـالەفەی پێغەمـبەر ( صـلی الله علیـه وسـلم ) لە کـردەوەیەك بکات ئەوا تەفصیلی تێدایە ، هەندێ کردەوە هەن ئەوەی پێچەوانەی بکات کافرە ، وەك ئەوەی پێچەوانەی پێغەمـبەر بکـات لە تەرك کردنـی نـوێژ ، یـاخود پێچەوانەی فەرمـانی پێغەمبەر بکات (صلی الله علیه وسلم) و دۆستایەتی کافرانی کرد و سەریانی خست وەکو سەرخستنی ئەمریکیەکان و هاوشێوەیان ، یاخود پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەر ( صلی الله علیـه وسـلم ) بکـات و یاسـایەك دابڕێژێـت ، لێـرەدا کـافر دەبێـت ، بەڵام ئـەگەر پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بکات ئـەگەر تـاوانە گەورەکـانی ئەنجامدا وەك زینا و درۆ و وازهێنان لەواجباتەکان وەك نوێژی جەماعەت لە مزگەوت ، ئەوەیان کافر ناکرێت بەڵام کورتی لەئیمان هێنانەکەی بەپەیامەکەی پێغەمبەردا هەیە و لەکۆمەڵەی هەڕەشە لێکراوانە .

7_ **مەزهەبی عەلمانیەکان:** لای ئەوان ئیمان هێنان بەپەیامەکەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بریتییە لە داننان بەپاڵەوانیەتی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) و کە لەگەورەیـانی مێـژووە و دان بەوەدا دەنـێن بەڵام بە گەورەی دادەنـێن وەك چـۆن گەورەیانی تر بە گەورە دادەنێن .

**بەشی دووەم: فەزڵەکانی ئوممەتی ئیسلامی :**

نوسەر باسی ئەوەی کردووە کەوا ئەو ئوممەتە چاکترینی ئوممەتانە ، وە فەرمووی : ( **ئوممەتێك ناچێتە بەهەشتەوە ئیللا دوای چوونی ئوممەتەکەی ئەو نەبێت بۆ بەهەشت** )

دواتر فەرمووی: ( **ئوممەتەکەی چاکترینی ئوممەتانە** ) .

ئەوەیان کە پەیوەستە بەفەزڵەکانی ئوممەتی ئیسلامی ، وە ئەویشان لەگەورەترین و باشترین ئوممەتە بەپێی ڕادە ، ئەوان لەزۆربەی ئوممەتان ئیماندارترن ، هەروەکو لەفەرموودەی صحيح دا هاتووە ، دواتر ئوممەتان خرانەڕوو و کۆمەڵەیەکی زۆر چاکم بینی دواتر چاکترینم بینی کە ئەویش ئوممەتەکەیەتی .

بەڵام سەبارەت بە ژمارەی ئوممەتان ئەوا حەفتا ئوممەتە وەك لەفەرموودەدا هاتووە: (ئێوە حەفتا ئوممەتەکە تەواو دەکەن لەڕۆژی قیامەتدا) [(125)] ، وە چاکترینی ئەو ئوممەتانە ئوممەتی پێغەمبەرە ( صلى الله عليه وسلم )، وە هاتووە لەفەرموودەدا کە ئەوان سێیەکی ئەهلی بەهەشتن ، وە هاتووە لە فەرموودەدا کە ڕیزەکان لەکاتی حەشردا سەد و بیست ڕیزە ، لەوانە هەشتا ڕیز لەو ئوممەتەن ، وە چاکترین ئوممەتی ئیسلام هاوەڵانن .

**بەشی سێیەم: فەزڵی هەندێك لە تاك تاکی ئەو ئوممەتە :**

نوسەر فەرمووی: ( وە چاکترینی ئوممەتەکەی ئەبوبەکری ڕاستگۆیە دواتر عومەری فاروقە دواتر عوسمانی خاوەن دوو نور ، دواتر علی ڕەزامەند ( الله تعالى لێیان ڕازی بێت ) ، کاتێك کە عبدالله بن عمر ( الله لێیان ڕازی بێت ) دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: ئێمە کاتێك کەوا پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) زیندووبوو دەمانگوت: چاکترینی

---

(125) الترمذي 226/5 (ح3001), وابن ماجه 1433/2 (ح4287), (ح4288) .

ئەو ئوممەتە دوای پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) ئەبوبەکرە دوای ئەو عومەر دوای ئەو عوسمان دوای ئەو علی و ئەوە دەگەیێنرا بە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) و ئینکاری لێ نەدەکرد ) .
وە بەدروستی گێڕدراوەتەوە لە علی ـەوە ( الله تعالی لێی ڕازی بێت ) کەوا فەرموویەتی : ( چاکترینی ئەو ئوممەتە دوای پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) ئەبوبەکرە دوای ئەو عومەر و ئەگەر بم ویستبایە ئەوا بەسێیەم ناودەبرام ) .
وە ئەبو درداء دەیگێڕێتەوە لەپێغەمبەری الله ـەوە ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : ( نە ڕۆژ هەڵهاتووەو نە ئاوابووە لەدوای پێغەمبەران و نێردراوان لە ئەبوبەکر چاکتر و باشتر ) .
وە ئەو ( ئەبوبەکر ) هەقترین بەندەی الله یە بۆ جینێشینی ( خیلافەت ) لەدوای پێغەمبەری الله وە ( صلی الله علیه وسلم ) بەهۆی فەزڵی و پێشخستنی بۆ نوێژ دابەستن لەسەر هەموو هاوەڵانەوە لەلایەن پێغەمبەری الله وە ( صلی الله علیه وسلم ) ، وە کۆدەنگی هاوەڵان ( الله لێیان ڕازی بێت ) لەسەر پێشخستنی و بەیعەت پێدانی ، وە نەدەبوو الله لەسەر گومڕایی کۆیان بکاتەوە دواتر دوای ئەو عمر دێت ( الله لێی ڕازی بێت ) بەهۆی فەزڵی و پەیمانی ئەبوبەکر بۆی ، دواتر عوسمان ( الله لێی ڕازی بێت ) بەهۆی پێشخستنی لەلایەن ئەهلی ڕاوێژەوە ، دواتر علی ( الله لێی ڕازی بێت ) بەهۆی فەزڵی و کۆدەنگی خەڵکی سەردەمی خۆی لەسەری .

ئەوانەش خەلیفە جێنیشینە ڕێپیشاندەر و ڕێنمایکراوەکانن ئەوانەی کەوا پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ( پەیوەست بن بە سوننەتی من و سوننەتی جێنشینە ڕێپیشاندەر و ڕێنمایکراوەکانی دوای من ، بە کاکیلەکانتان بیگرن ) .
وە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی: ( جێنیشینیایەتی لەدوای من سی ساڵە ) جا کۆتاییەکەی خیلافەتەکەی علی بوو ( الله لێی ڕازی بێت ) .
وە شایەدی بەهەشت دەدەین بۆ دە ( 10 ) مژدەپێدراوەکە هەروەکو چۆن پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) شایەدی بۆ داون ، پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم )

فەرموویەتی : ( ئەبوبەکر لەبەهەشتە وە عومەر لەبەهەشتە و عوسمان لەبەهشتە و علی لەبەهەشتە و طلحة لەبەهەشتە و زوبەیر لەبەهەشتە و سعد لەبەهەشتە و سعید لەبەهەشتە و عبدالرحمنی کوڕی عەوف لەبەهەشتە و أبو عبیدەی کوڕی جراح لەبەهەشتە ) .
وە هەر کەسێك کە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیە وسلم ) شایەدی بۆ بدات ئیمەش شایەدی بۆ دەدەین وەك وتەی: ( حەسەن و حسێن پێشەوای گەنجانی ئەهلی بەهەشتن ) وە وەك وتەکەی بۆ ثابتی کوڕی قیس: ( ئەو لەئەهلی بەهەشتە ) .
بۆیە چاکترینی ئەو ئوممەتە دوای پێغەمبەر علیە السلام ئەبوبەکرە ، نوسەر فەرمووی: ( **وە چاکترینی ئوممەتەکەی ئەبوبەکری ڕاستگۆیە** ) ئەوەشیان بە کۆدەنگی .
دووەمیان عومەری کوڕی خطاب ( الله لێی ڕازی بێت ) و وەصفیکردووە بە ( **فاروق** ) ئەو وەصفەش لەلایەن پێغەمبەرەوەیە ( صلی الله علیە وسلم ) ، پێغەمبەری الله ( صلی الله علیە وسلم ) وەصفی کردووە ، وەك چۆن وەصفی ئەبوبەکری کردووە بە ڕاستگۆ .

پاشان عوسمان ( الله لێی ڕازی بێت ) ، سەبارەت بەچاکترین و پێشخستنی ئەبوبەکر و عومەر ئەوەیان کۆدەنگی لەسەرە ، بەڵام عوسمان ئەوا کۆدەنگی موهاجیرەکان و ئەنصاری لەسەرە کاتێك کە عوسمانیان پێش خست لەعەلی بۆ خیلافەت ، وە هاوەڵان ڕاجیاییان نەبووە لەوەی عوسمان کەسی سێهەمینە لە فەزڵدا دوای ئەبو بەکر و عومەر ، بەڵام لەسەردەمی تابعین دا ڕاجیاییان دروست بوو لەسەری ، هەندێك لەسەلەف کە بەشێکی کەمن ، عەلیان پێش خست ، بەڵام دواتر گەڕانەوە لەو ڕایە ، وە هەندێك سەلەف تەوەقوفیان کرد و هیچ یەکێکیان پێش ئەوەی تریان نەخست ، بەڵام مەزهەبی تابعین دامەزراوبوو لەدواتردا لەسەر بەفەزڵدانانی عوسمان بەسەر عەلیدا دواتر وتەی پێشخستنی علی وازی لێهێنرا و بەو شێوەیە تەوەقوفیش وای لێهات کە بنچینە دامەزرا لەسەر پێشخستنی عوسمان بەسەر عەلیدا لە خیلافەت و فەزڵدا .
پاشان نوسەر وەصفی عوسمانی کردووە بەخاوەنی دوو نورەکە ئەو صیفەتەش والله اعلم لە سەردەمی تابعین دا هات ، اللالکائی نەقڵی کردووە بەسەنەدەکەی لە حسینی

الجعفیەوە کە فەرموویەتی: ئایا دەزانیت بۆچی عوسمانیان ناونرا بەخاوەنی دوو نورەکە ، فەرمووی: چونکە هیچ کەسێك نەبووە لەسەرەتای ئادەمەوە تاوەك محمد علیه السلام کە هاوسەرگیری لەگەڵ دوو کچی پێغەمبەرێکدا کردبێت جگە لە عوسمان نەبێت ، جا هۆکاری ناونانەکەی بەو ناوە ، ئەوە دەبێت کە هاوسەرگیری لەگەڵ دوو کچی پێغەمبەری الله کردووە .

پاشان ئەفزەلیەت بۆ علی ـە ( الله تعالی لێی ڕازی بێت )، وە نوسەر ناوی بردووە بە (**ڕەزامەند**) بەڵام هۆکاری ناونانەکەی بەو ناوە ــ والله اعلم ــ وەرگیراوە لەو فەرموودە صحیحەی لەبوخاریدا هاتووە کەوا پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) پێی فەرموو : ( ئایا ڕازی نابیت بەوەی لەمن بیت بەڕادەی هارون بۆ موسی ، هیچ پێغەمبەرێك لەدوای منەوە نییە ) [126] وە شایەدیش وتەکەیەتی: ( ( ئایا ڕازی نابیت ) .

پاشان دوای ئەوانە دە ( 10 ) کەسەکەن ، ئەوانە چاکترینی هاوەڵانن لەدوای چوار خەلیفەکە ، کە شەش کەسەکەن کە ماون ئەوانیش طلحة و زوبەیر و هەردوو سەعدەکە ( سەعدی کوڕی ابی وقاص ، وە سەعیدی کوڕی زەید ) وە هەردوو عبدەکان (عبدالرحمنی کوڕی عەوف ، وە ئەبو عوبەیدە ) ، دواتر ئەهلی بەدر کە ژمارەشیان سێ سەد و هەندێکە ، دواتر بەدوای ئەوان ئەهلی بەیعەت الرضوان و ئەهلی ئوحود ، دواتر هەرکەسێك موسڵمان ببێت دوای سوڵحی حودەیبیە تاوەکو فەتح کردنی مەککە ، دواتر لە فەتحی مەککەوە تاوەك مردنی پێغەمبەر علیه السلام .

ئەوەیان بەگوێرەی تاك تاك ، بەڵام بەگوێرەی جنس ، چاکترینی ئەو ئومەتە موهاجیرانن ، پاشان ئەنصار ، پاشان هەرکەسێك موسڵمان بوبێت دوای سوڵحی حودەیبیە تاوەکو وەفاتی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) .

**پرسێك: خیلافەت و ڕێکخستنی و هەقترینیان :**

خیلافەت: سەبارەت بەخیلافەت ئەوا سەلەف کۆدەنگبوون لەسەر ئەوەی هەقترین کەس بۆ خیلافەت ئەبوبەکرە ، دواتر عومەر ، دواتر عوسمان ، دواتر علی کوڕی ابی

(126) رواه البخاري في صحيحه 1359/3 (ح3503), وأحمد في مسنده 173/1 (ح1490).

طالب ، ئەوەشیان بەکۆدەنگی سەلەف ، ئەوەی پێش و پاش بەو ڕێزبەندیە بکات ئەوا موبتەدیعە لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت ، ئەوەی بلێت: عەلی هەقترە بۆ خیلافەت لەعوسمان ، ئەوا گومڕایە ، وە گومڕاترە لەگوێدرێژی خاوەنەکەی ، وەك ابن تیمیة لە واسطیة فەرموویەتی ، وە پرسی خیلافەت و ڕێزبەندی خەلیفەکان لەسەر شێوەی پێشوو ، ئەوەیان بە کۆدەنگی سەلەف ، وە کەس پێچەوانەی نەکردووە ، بەڵام پرسی فەزڵ و بەفەزڵدانان ، ئەوا ڕاجیایی دروست بوو لەسەر عوسمان و علی ، دواتر سەلەف جێگیربوون لەسەر بەفەزڵدانانی عوسمان بەسەر علی ـدا .

**دواتر نوسەر باسی بەڵگەکانی کردووە لەسەر ڕیزبەندی خەلیفەکان لەڕووی هەقێتیەوە ، بەلام بەڵگە لەسەر هەق بوونی ئەبوبەکر ، بەو شێوەیەیە :**

1_ بەهۆی فەزڵی .

2_ بەهۆی پێشخستنی .

3_ پێشخستنی بۆ نوێژ دابەستن بەسەر هەموو هاوەڵاندا لەلایەن پێغەمبەری الله وە (صلى الله عليه وسلم) .

4_ کۆدەنگی هاوەڵان لەسەر پێشخستنی و بەیعەت پێدانی ، وە نەئەبوو کە الله لەسەر گومڕایی کۆیان بکاتەوە .

بەڵام بەڵگە لەسەر بەهەق بوونی عومەر: نوسەر بەو شێوەیە باسی کردووە: وە باسی دوو هۆکاری کردووە :

هۆکاری یەکەم: فەزڵی عومەر .

هۆکاری دووەم: پەیمانی ئەبوبەکر بۆی .

بەلام بەڵگە لەسەر بەهەق بونی عوسمان بۆ خیلافەت لەدوای عومەرەوە: نوسەر باسی یەك بەڵگەی کردووە ، ئەویش بریتییە لە پێشخستنی لەلایەن ئەهلی ڕاوێژەوە ، وە دروستە شتێکی تریشی بۆ زیاد بکرێت ئەویش کۆدەنگی خەڵکی لەسەر دەسەڵات پێدانی و هەوڵبژاردنیان بۆی .

بەڵام بەڵگە لەسەر بەهەق بوونی علی بۆ خیلافەت: نوسەر باسی دوو بەڵگەی کردووە بۆ ئەوە :

1_ فەزڵی .

2_ کۆدەنگی خەڵکی سەردەمی بۆی .

وە نوسەر ئەو چوارەی ناوبردووە بەخەلیفە ڕێپیشاندەرە ( ڕاشدینە ) ڕێنمونیکراوەکان ، وە خیلافەتیان خیلافەتی پێغەمبەرە ( صلی الله علیە وسلم )، وە پشتی بەدوو بەڵگە بەستووە :

1_ وتەی پێغەمبەری الله ( صلی الله علیە وسلم ) : ( پەیوەست بن بەسوننەتی من و سوننەتی جێنشینە ڕێپیشاندەر و ڕێنمایکراوەکان ) .

2_ فەرموودەی: ( جێنیشینیایەتی لەدوای من سی ساڵە ) [127] ، جا کۆتاییەکەی خیلافەتەکەی علی بوو ( الله لێی ڕازی بێت ) .

**پرسێك: ئایا خەلیفەی تری ڕاشدین هەیە جگە لەو چوارە :**

هەندێك لە ئەهلی زانست عومەری کوڕی عبدالعزیزی بۆ زیاد دەکەن ، وە دەیکەن بەخەلیفە ڕاشدینەکان ، وە هەندێکی تریان مەهدی زیاد دەکەن ، کاتێك کە باسی پیغەمبەری الله ی کردووە لەسیرەکەیدا ( ژیاننامەکەیدا ) علیە السلام .

پاشان نوسەر چووە بۆ پرسی شایەتیدان ، وە ئایا شایەدی بەهەشت دەدرێت بۆ هیچ کەسێك یاخود نا ، دواتر باسی بنەمایەکی کردووە ، ئەوەی کە هەرکەسێك پێغەمبەری الله ( صلی الله علیە وسلم ) شایەدی بەهەشتی بۆ دابێت ئەوا شایەدی بەهەشتی بۆ دەدرێت ، وە باسی دە ( 10 ) مژدەپێدراوەکەی بەهەشتی کردووە ، وە باسی هەندێك لەهاوەڵانی کردووە وەك حەسەن و حسێن و ثابتی کوڕی قەیس وە نوسەر مەبەستی لە هەر ئەوەندە نییە ، ئەگەرنا هەندێك هاوەڵی تر هەیە کە شایەدی بەهەشتیان بۆ دراوە وەك بیلال و عبدالله کوڕی سەلام و خەدیجە و حەمزە .....هتد ، جا هەرکەسێك هاتبێت لە فەرموودەی صەحیحدا شایەدی بۆ درابێت ئەوا شایەدی بۆ دەدرێت .

(127) الترمذي 503/4 (ح2226)، وأحمد 220/5 (ح21969).

**پرسـيّك: هـاوەڵانی تـر كە مـاون ئەوانەی كە شـايەدی بەهەشـتيان بـۆ نەدراوە ، ئايـا شايەديان بۆ دەدرێت ؟**

دروست ئەوەيە كە هاوەڵان تێكڕايان شايەدی بەهەشتيان بۆ دەدرێت و بەڵگەش هەن كە ئەوە دەسەلمێنن :

1ـ وتەی الله تعالی: ( **لَّقَد تَّابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ** )(128) . ئەمەش بۆ موهاجيرەكان و ئەنصارەكانە .

2ـ بەڵام جگە لەوان ئەوا لەوتەی الله تعالی: ( **لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً ....... وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ** )(129) واته بەهەشت ، ( وكلاً ) واته هاوەڵان هەموويان بەڵێنی بەهەشتيان داونەتێ ، لەگەڵ بەڵێنی الله بۆ چاكەكاران : ( **إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَىٰ أُولَٰئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ** ) .

3ـ وتەی الله تعالی: ( **لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ * وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ * وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ** )(130) ، وە خەڵكی دوای هيجرەت لەپێشترين ئەوانەن كە دەچن بۆ ناو ناوی هاوەڵانەوە .

4ـ وتەی الله تعالی: ( **يَوْمَ لَا يُخْزِي اللَّهُ النَّبِيَّ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ** ) وە هەموو هاوەڵان ئيمانيان هێنا لەگەڵيدا .

(128) سورة التوبة: 117 .

(129) سورة الحديد: 10 .

(130) سورة الحشر: 8 ـ 9 ـ 10 .

**بەڵام لەسوننەتدا** لەوانە: فەرموودەی: ( ئێوە شایەدیدەرانی الله ن لەسەر زەویەکەی ) ، جا هاوەڵان شایەدی دادپەروەریان بۆ دراوە بەکۆدەنگی .

وە فەرمـوودەی: ( چـاکترینی سـەدەکانی سـەدەی مـنە ) وە ابـن حـزم هەڵبـژاردووە لەکتێبەکەیدا بەناوی (الدرة: لاپەڕە 367) فەرموویەتی: وە تێکڕای هاوەڵان لەوانەی کە هاوەڵایەتیان کردووە تەنانەت ئەگەر بۆ ڕۆژێکیش بێت جگە لەدووڕوان بەبەبێ هیچ گومانێك لەبەهەشتن .

وە پشتیوان بەستووە بەو فەرموودەیەی کە ضیاء ڕیوایەتی کردووە لەکتێبی المختارة پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی: ( ئاگر ئەو کەسە ناگرێتەوە کە منی بینیبێت ) [131] ، وە بەهەمان شێوە بەگشتێتی فەرمـوودەی: ( الله الله بـۆ هـاوەڵانم ئەوەی خۆشی بوێن بەخۆشەویستی خۆم خۆشم دەوێن ، ئەوەشی ڕقی لێیان ببێتەوە ئەوا بەرِق و کینەی خۆم ڕقم لێیان دەبێتەوە ئەوەشی ئازاریان بدات ئەوا ئازاری منی داوە ، ئەوەشی ئەزیەتی من بدات ئەوا ئەزیەتی الله ی داوە ئەوەشی ئەزیەتی الله بدات ئەوا خەریکە الله بیگرێت ) ترمذي گێراویەتیەوە بە حەسەنی داناوە بەغەریبی داناوە وە صیوطیش بەحەسەنی داناوە وە ابن حبان بەصحیحی داناوە و ئیمامی احمد ڕیوایەتی کردووە .

وە گشتیەتی فەرمـوودەی: ( ئەوەی تانـە و جنێو بەهاوەڵانم بدات ئەوا نەفرەتی الله ی لێبێت ) فەرموودەکە احمد و طبراني ڕیوایەتیان کردووە وە الباني بەصحیحی داناوە لە جامعدا .

وە گشتیەتی فەرموودەی: ( تـانە و جنێـو لە هـاوەڵانم مەدەن چـونکە الله فەرمـانی پـێم کـردووە بەداوای لێخۆشـبون کـردن بۆیـان ) ابـن بطـة هێنـاویەتیەوە لە کتێبـی ( الإبانـة الصـغرى ) لاپەڕەی 119 ، اللالکـائی ڕیـوایەتی کـردووە لەکتێبـی أعتقـاد أهـل السـنة (1319/4)

---

(131) رواه الترمذي في سننه 694/5 , (ح3858).

**پرسێك: ئایا شایەدی بەهەشت بۆ تابعین دەدرێت ؟**
بەڵام سـەبارەت بە تـابعین ئەوا هەنـدێك لەزانایـان وای بۆچـوون کە بەڵـێ شـایەدی بەهەشتیان بۆ دەدرێت ، وە عبدالغني النابلسي هەڵیبژاردووە لە کتێبی لمعة الأنوار في المقطوع لهم بالجنة أو النار .

وە فەرمووی هەروەها شایەدی بەهەشت بۆ تابعینیش دەدەین ، وە پشتیان بەستووە بۆ ئەوە بـۆ فەرمـوودەکەی پێشـوو: ( ئاگـر ئەو کەسـە نـاگرێتەوە کە منـی بینیبێـت ، وە ئەو کەسـەش نـاگرێتەوە کە ئەو کەسـەی بینیـوە کە منـی بینیـوە ) وتەی دووەمـیش ئەوەیە شایەدی بەهەشتیان بۆ نادرێت .

تەنیـا ئەوە نەبێـت کە هەنـدێك لەسـەلەف شـایەدی بەهەشـتیان داوە بـۆ هەنـدێك لە تابعین وەکو عومەری کوڕی عبدالعزیز وە حەسەنی بەصری وە ئیمامی احمد ، ئەبو ثور سوێندی خواردووە کە احمدی کوڕی حنبل لەبەهشتە ابن تیمیة باسی کردووە لە مجموع الفتاوی .

**وە ئایا شایەدی بەهەشت دەدرێت بۆ جگە لەوانەی کە باسمان کرد ؟**
هەندێك لە ئەهلی زانسـت بۆ ئەوەچوون کە ئەو کەسـەی بـاش ستایشی کرابێت ئەوا لە ئەهلی بەهەشـتە ، وە پشـتیان بەسـتووە بە فەرمـوودەی صـحیح کاتێـك کە جەنـازەیەك بەپێشـیاندا هـات بەچـاکە ستایشـیان کـرد ، پێغەمـبەری الله ( صـلی الله علیـه وسـلم ) فەرمووی : واجب بوو ، کاتێك کە پسیاریان لێکـرد فەرمـووی: بەهەشـت واجب بوو ، ئینجـا فەرمووی : ( ئێوە شاهیدی دەرانی الله ن لەسەر زەوی ) [132] .

**وە ئایا چۆنیەتی ڕێکخستنی ئەوە چیە :**
ڕێکخستنەکە ئەوەیە ئەگەر زانایانی ئوممەت شایەدیان بۆ دا وە ئەهلی حەل و عەقد لە ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوا ئەو کەسە شایەدی بەهەشتی بۆ دەدرێت لەبەر وتەکەی

(132) رواه البخاري في صحيحه 460/1 (ح1301), ومسلم في صحيحه 655/2 (ح949), والترمذي في سننه 373/3 (ح1058).

پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) : ( ئێوە شایەدیدەرانی الله ـن ) مەبەستی لە هاوەڵانە ، وە هەر کەسێك هاوشێوەی هاوەڵان بێت لەدادپەروەری ، وە ئینصاف ئەوەیە ئەوەی تعدیل و قدح و ئینصاف بزانێت ئەوانە شایەدی دەرانی الله ن ، وە هەموو سەردەمێك شایەدی دەرانێك هەن و هەموو شوێنێك شایەدیدەرانی الله لەسەر زەویەکەی تێدا هەیە تا ڕۆژی دوایی ، وە نمونەی ئەوە مەهدی ستایش هاتووە لەسەری لەفەرموودەدا وە وەك مالك و شافعی و گەورەیانی ئەهلی زانست ...... هتد .

## بەشێك

### نوسەر فەرموویەتی :

وە شایەدی بەهەشتی یاخود دۆزەخی هیچ کەسێك نادەین لەئەهلی قیبلە مەگەر ئەوەی پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) شایەدی بۆ دابێت بەڵام بۆ چاکەکار تکاکارین و دەترسین بۆ خراپەکار .

وە هیچ کەسێك لەئەهلی قیبلە کافر ناکەین بەتاوان ( تاوانێك کە لەئیسلامی ناباتە دەرەوە ) وە لەئیسلامی نابەینە دەرەوە بە کردەوە ( کردەوەیەك کە لەئیسلامی ناباتە دەرەوە ) .

### ڕوونکردنەوە :

دوای ئەوەی کە نوسەر تەواو بوو لە شایەدیدان بۆ ئەهلی فەزڵ و ستایش کراوان لەوەی کە لە ئەهلی بەهەشتن ، هاتووە فەرموویەتی: ئایا شایەدی دەدرێت بەبەهەشت یاخود بەدۆزەخ بۆ جگە لەوانە ؟

**وەڵام**: جگە لەوانەی پێشوو باسکران ، وەك موسڵمانی ئاسایی کە فەزڵی بڵاونەبوەتەوە ، ئەوەیان کەس شایەدی بەهەشتی بۆ نادات ، بەڵام تکای چونە بەهەشتی بۆ دەکرێت ، بەهەمان شێوە شایەدی دۆزەخ بۆ هیچ کەسێك نادرێت ، بەڵکو ترسمان هەیە بۆ خراپەکار لەوەی بچێتە دۆزەخەوە ، باسەکەی لەنێوان تکاکردن بۆ چاکەکار و ترس بۆ خراپەکارە .

وە وتەی نوسەر ( **شایەدی نادەین** ) نەفی کردنی شایەدیدانە ، وە وتەکەی ( **شایەدی نادەین** ) وە نەی فەرموو شایەدی نادەم بەتەنها چونکە مەبەستی لە لەفزەکە ئەهلی سوننەیە ، وە وتەکەی ( **لەئەهلی قیبلە** ) مەبەستی لە ئەهلی قیبلە لەو کەسەیە کەخاوەنی تەوحید بێت ( **شایەدی لا إله إلا الله** ) وە هیچ هەڵوەشێنەرەوەیەکی تووش نەبووبێت ، ئەوەیان پێناسەی ئەهلی قیبلەیە لەشەرعدا ، **وە پێویستی بەدوو مەرجە** :

أ_ بەوەی دوو شایەتوومانەکەی هەبێت ، ئەوەشیان مەرجێکی ئەرێ ییە .
ب_ هیچ هەڵوەشێنەرەوەیەك لەهەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامی تێدا نەبێت ، ئەوەشیان مەرجێکی نەرێ ییە .
ئەگەر تەوحیدی نەبێت ئەوا لەئەهلی قیبلە نییە ، وە ئەگەر تەوحیدی هەبوو وە هەڵوەشێنەرەوەیەکی تێکەوت ئەوا لەئەهلی قیبلە نییە ، بەڵام ئەوانەی کەوا لە ئەهلی قیبلە نین وەك جەهمیەکان ، ئەوانە هەڵوەشێنەرەوەیان تیادایە کەوا بریتیە لەئینکاریکردنیان بۆ ناو و صیفەتەکانی الله ، وە هاوەشێوەی ئەو کوفرانەی کە تێیاندا هەیە .
وە وەك رافضەی ئەو زەمانە لەئەهلی قیبلە نین بەهۆی بوونی هەڵوەشێنەرەوە تێیاندا ، وە وەك عەلمانییەکان و حاکمە هەڵگەڕاوەکان لەو سەردەمەی ئێمەدا لەو کەسانەی کەوا بانگەشەی ئیسلامەتی دەکەن ئەوا لە ئەهلی قیبلە نین بەهۆی هەبوونی هەڵوەشێنەرەوەوە ، وە سەردەمیەکان و نەتەوەپەرستەکان و بەعثیەکان و دیموکراسیەکان و ئیشتراکیەکان و هاوەشێوەیان دەگرێتەوە لەو کۆمەڵانەی تریش کە سەر بەئەهلی قیبلە نین ، وە سودی ئەوە ئەوەیە لەوەی هەرکەسێك لەوانە بمرێت لەو کۆمەڵانە لەسەر ئەوەی لەسەرین ، ناچێتە ناو ئەو پرسەوە ، وە ناگوترێت شایەدی ئاگری بۆ نادەین ، وە بەڵگەش لەوە ئەوەیە کە هەرکەسێك لە هەڵگەڕاوان بمرێت شایەدی دۆزەخی بۆ دەدرێت .

ئەوەی ئەوەش دەسەلمێنێت فەرموودەی بني المنتفق ـە ئەویش فەرموودەیەکی صحیحە ، هاتن بۆ لای پێغەمبەری الله علیه السلام پسیاریان لێکرد لە فەرموودەیەکی درێژدا سەبارەت بەو کەسانەی مردوون لەئەهلی فترە ، پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( سوێند بە نەمری الله بەسەر گۆڕی هەر عامریەك یاخود قوڕەیشیەکی موشریکدا تێپەڕیت بڵێ: محمد منی ناردووە بۆ لات تاوەك مژدەت پێ بدەم بەو ناخۆشیەی بەسەرتا دێت و بەسەر ڕوخسارت و زگت دا دێت لەناو ئاگردا )[133] ،

(133) مسند الإمام أحمد 13/4 (16251) .

إبـن القـيم له ( الهـدى ) دا دەفەرمووێـت: له سـوودەكانی ئەو فەرمـوودەیە ئەوەیە كە شایەدی دۆزەخ دەدرێت بۆ ئەو كەسەی لەسەر شیرك مردبێت .

2ـ ڕوودوای هەڵگەڕاوەكان ، ئەوانە كاتێك كە تەوبەیان كرد و داوای پێكهاتنیان كرد لە ئەبـوبەكر ( الله لێـی ڕازی بێـت ) ، ئەبـوبەكر ( الله لێـی ڕازی بێـت ) مەرجێكـی لەسـەر دانان ، وە فەرمووی: ( تاوەك شایەدی نەدەن بەوەی كەكوژراوەكانی ئێمە لەبەهەشتن و كوژراوەكـانی ئێـوە بـۆ دۆزەخـن ) [134] ، وە شـایەدی وتەكەی: ( وە كوژراوەكـانی ئێـوە بـۆ دۆزەخـن ) ، بەڵـگەیە لەوەی كە دروسـتە شـایەدیدان بەدۆزەخ بـۆ هەڵـگەڕاوە لەدیـن ئەگەر لەسەر هەڵگەڕانەوە بمرێت .

پاشان نوسەر ڕاستەوخۆ چووە بابەتی تەكفیر و ئایا هیچ كەسێك لە ئەهلی قیبلە كافر دەكرێت یاخود كافر ناكرێت ؟

نوسەر فەرمووی: ( **وە هیچ كەسێك لەئەهلی قیبلە كافر ناكەین بەتاوان ( تاوانێك كە لەئیسلامی ناباتـە دەرەوە ) و لەئیسـلامی نـابەینە دەرەوە بە كردەوە ( كردەوەیـەك كـە لەئیسلامی ناباتە دەرەوە** ) .

نوسـەر قسـەی لەسـەر بـابەتی تەكفیركردنـی ئەهلـی قیـبلە كـردووە و چەنـد پرسێك لەخۆ دەگرێت :

**پرسی یەكەم: مەبەست چییە لە وشەی ( بە تاوان ) و وشەی ( بەكردەوە ) ؟**

ئەو دوو وشـەیە لەوانەیە تێگەیشـتنێكی هەڵەی لـێ وەربگیردرێـت ، وە هەنـدێك جـار تێگەشـتنێكی لەسـەر شـێوەی گشـتگیری لێوەردەگیرێـت ، وا دەزانێـت كە قسەكـەی گشـتتیە وە بەو شـێوەیەش نییە ، مەبەستی لە ( **بەتـاوان** ) ئەوەیـە: واتە تاوانەكـان كە ناودەبرێن بەتاوانە گەورەكان ، وە هاوشێوەی ئەوە وشەی ( **بەكردەوە** ) ئەوەیان بۆ سێ شت دەردەبڕدرێت :

(134) رواه أحمد في مسنده 387/1 (ح2609) .

أ_ **بۆ ئەهلی تاوانە گەورەکان**: وەك دزین و زینا و غەیبەت و خراپ باسکردن و نێربازی وە هاوشێوەکانیان ئەوەیان ئەهلی سوننەت و جەماعەت کەس بەوە کافر ناکەن .

ب_ **شرکی بچووك**: ئەوەشیان دەچێتە ژێرباری وتەکەی نوسەر بە شرکی بچوك کەس کافر ناکرێت .

ج_ **تاوانە بچوکەکان** ، ئەوەی کە لەشەرعدا باس لەحەرامیەتی کراوە بەڵام سزایەکی تایبەت نەهاتووە لەبارەیەوە ، ئەوەیان ئەهلی سوننەت و جەماعەت کەس بەوە کافر ناکەن .

وە هەندێك تاوان هەیە نوسەر **لەو قسەیەیدا مەبەستی لێ نەبووە** ، وەك شرکی گەورە و کوفری گەورە ، ئەوەیان ئەهلی سوننە و جەماعە خەڵکی پێ کافر دەکەن ، جا کوفرێکی گەورەی سەرچاوەکەی لەدڵەوە بێت یاخود کرداری بێت یاخود گوفتاری بێت .

وە وتەی نوسەر ( **بەکردەوە** ) مەبەستی پێ لەو کردەوانەن کە تاوان و سەرپێچین .

**پرسی دووەم**: وتەی نوسەر ( ئەهلی قیبلە ) مەبەست لەو کەسانە کێیە ؟ مەبەستی لە ئەهلی قیبلە **چەند کۆمەلەیەکن** :

أ_ پێشکەوتوان ( ئەوانەی دەستپێشخەری بۆ هەموو چاکەیەك دەکەن ) .

ب_ مامناوەندەکان .

ئەو دوو جۆرەشیان لە کۆمەڵەی مەدح و ستایشکراوانن و ئەهلی بەهەشتن ، الله تعالی فەرموویەتی: **( ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ )** [135] وە ئەوانە کافر ناکرێن .

ج_ کەمتەرخەم و ستەم لەخۆکەر : ئەوانەش ئەهلی تەوحیدن ئەوەی شتێك لە تاوانەکان بکات و لەسەری بمرێت ، یاخود پێداگر بێت لەسەری ، وە مەرجیش بۆ ئەوەی ئەو کەسانە ناوببرێن بە ئەهلی قیبلە ئەوەیە ، بەوەی تەوحیدیان هەبێت ، وە هیچ هەڵوەشێنەرەوەیەك لەهەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامیان تێدا نەبێت .

(135) سورة فاطر: 32 .

د_ بیدعەچیان: یاخود ئەوانەی کەبیدعەیەکیان تێدایە ، بەمەرجێك ئەو بیدعەیەیان بیدعەی موکەفیرە نەبێت ، وەك ئەوانەی نیوەی شەوی شەعبان زیندوو دەکەنەوە و وەك پێشخستنی وتار بەسەر نوێژ لەجەژندا ، وە وازهێنانی هەندێکیان بە ئاشکرا لە تەکبیر کردن ، وەك دواخستنی نوێژ بۆ کۆتایی کاتە پێویستەکەی ، وە وەك کەللابیەکان وە وەك یەکەمەکانی ئەشعەریەکان وەك أبي حسني اشعري و باقلانی ، وە وەك کەڕامیەکان ئەوانە بیدعەچین وەك خەواریجی یەکەم و ناودەبرێن بە ( موحەکیمەکان ) ئەوانە بیدعەچین و کافر نین ، وە وەك مورجیئەی فقهاء ، ئەو کۆمەڵانەن کە ناودەبرێن بەئەهلی قیبلە .

**پرسی سێیەم: ئەهلی قیبلە دابەش دەبن بۆ دوو بەش :**

أ_ ئەوانەی بە هەقیقەت ئەهلی قیبلەن ، بەواتای ئەوەی دروستە ئەو ناوەیان لێ بنرێت ، ئەوانیش ئەو کۆمەلانەی پێشوون .

ب_ ئەهلی قیبلە بەبانگەشەی خۆیان یاخود خۆ دانەپاڵ ئیسلام یاخود تەنها بەناسینیان ، یاخود بەگوێرەی پێش تەکفیر ، ئەوەش ئەو کەسانەن کە خۆیان داوەتە پاڵ قیبلەی موسڵمانان و کوفرییەکی تیا کۆبووەتەوە ، بۆیە ناونانی ئەمانە بەئەهلی قیبلە درۆ و بوهتانە ، وە دروست نییە ئەو ناوەی لێبنرێت .

ج_ ئەو بەشەشیان کەوا نوسەر باسی نەکردووە ، ئەوانیش ئەو کۆمەڵانەن کە پێیان دەگوترێت ئەهلی قیبلە لەکاتێکدا کافرن ، ئەوانیش بەو شێوەیەن: جەهمیەکان ، موعتەزیلە زێدەڕووچووەکان: ئەوانە دروست ئەوەیە کە کافرن .

**ڕافیضەکان:** ئەوانەش لە ئەهلی قیبلە نین و بەڵکو بەهەقیقەت کافرن ، زاناکانیان و کۆی گشتی خەڵکەکانیان .

**عباد القبور ( گۆڕ پەرستان ) :** ئەوانەش موشریکن بە کۆدەنگی موسلمانان ، محمدی کوڕی عبدالوهاب تەکفیرکردنیانی نەقڵکردووە لەهەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام _ هەڵوەشێنەرەوەی دووەم _ ، وە پێش ئەویش ابن تیمیە نەقڵی کردووە وەك چۆن لە

(كشف القناع ) دا هاتووه: ئەوەی لەنێوان خۆی و الله دا واستەیەك دابنێت پاڕانەوەیان لێبكات داوای شەفاعەتیان لێ بكات كافربووه به كۆدەنگی .
**صۆفیەكان** ئەوانەی كه كوفریان هەیه ، وەك پەنابردن بۆ پیاوچاكان و هاوەشێوەی ئەو كوفریانه ، ئەوانه موشریكن ئەگەر به ئەهلی قیبلەش ناونرابن .
**عەلمانییەكان**: بەهەموو جۆرەكانیانەوه ، كافرن ئەگەر بەئیسلامیش ناویان نرابێت ، یاخود ئەگەر بلێن ئێمه دەولەتێكی ئیسلامین و دەسەڵات داری موسڵمانانین ، ئەوانەش لەهەقیقەتدا علمانین و كافرن .
**وه جۆرەكانی عەلمانیەكان** وەك: سەردەمیەكان دیموكراسیەكان پەرلەمانیەكان ، بەعسیەكان و نەتەپەرستەكان ، وه شیوعیەكان و ئیشتراكیەكان ، ئەوانه هەموویان كافرن جا ئەگەر نوسەر بێت یاخود رۆژنامەنوس یاخود سیاسی بێت یاخود راگەیاندكاران بن یاخود سەربازان بن یاخود ئابوریناسان بن ...... هتد .

**وه هەیانه كه ناودەبرێن به ئیسلامیەكان و ئەوانه كوفریان تێدا كۆبوەتەوه** وەك ئیسلامیەكان كه تەشریع دانان بۆ جگه له الله بەدروست دادەنێن یاخود ئەوانەی كه هاوپەیمانی دەبەستن لەگەڵ عەلمانیەكان ، وه وادەخوازێت كه ئەوەی هاوپەیمان بێت لەگەڵ عەلمانیەكان ئەوا وادەخوازێت كه كوفرێك بكەن كه دەیزانن ، ئەوانه كافرن ئەگەر بانگەشەی ئەوەش بكەن كه ئیسلامین .
وه لەو كۆمەڵانه كۆمەڵێكیان ناودەبرێن به سەردەمیەكان ، ئەوانەش ئەو كەسانەن كه بانگەشەی پێشخستنی تەشریع دەكەن ، تاوەك لەگەڵ سەردەم بیگونجێنن ، یاخود پێشخستنی بنەماكانی فقهـ تاوەك لەگەڵ سەردمدا بگونجێت ، وه هاوشێوەی ئەو كەسانەش كه كوفرێك دەكەن وەك ئەوانه .

## بەشێك

**نوســەر فەرمــوویەتی :** وە وا دەبینــین کە حەج و جیهــاد بەردەوامە لەگەڵ گــوێڕایەڵی هەموو پێشەوایەك چاکەکار بێت یاخود تاوانبار وە نوێژی جەماعەت لە دوایان دروستە . انس فەرموویەتی: پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی: ( **سێ شت لە بنچینەی ئیمانە: دەست هەڵگرتن لەو کەسەی بلێت لا اله الا الله و کافری ناکەین بە تاوان ، وە بەکردەوە لەئیسلامی دەرناکەین و جهاد ماوە لەو کاتەی الله منی ناردووە هەتاوەکو کۆتایی ئوممەتەکەم کە جەنگی دەجال دەکەن ، زوڵمی زاڵمێك لەکاری ناخات نەدادوەری دادوەرێك و ئیمان هێنان بە قەدەرەکان** ) ابو داود ڕیوایەتی کردووە .

### ڕوونکردنەوە :

پاشـان نوسـەر باسـی **پرسـەکانی پێشـەوایەتی** و ئەو لایەنـانەی پەیوەنـدیان پێـوە هەیە کردووە :

ئەویش چەند پرسێکە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە دەبێت هەڵوێست چۆن بێت بەرامبەر پێشەواکان و کاربەدەستان و ئەوانەش کە واجبە لەسەریان .

نوسەر فەرموویەتی ( **وە وای دەبینین** ) نەی فەرموو ( **وایدەبینم** ) بەڵکو ئەو قسەیەی دەربڕیوە بە وتەکەی ( **وای دەبینین** ) وە بکەری ( **وای دەبینین** ) کۆیە بۆ جەماعەتە وە هۆکاریش ئەوەیە کە نوسەر باسی مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە دەکات ، وەك چۆن لەپێشووتردا فەرمووی: ( **شایەدی دەدەین** ) وە فەرمووی: ( **شایەدی نادەین** ) لەوانەی کە بەڵـگەن لەوەی کە بیروبـاوەڕی ئەهلـی سـوننە و جەمـاعە ڕوون دەکـاتەوە لە باسـی واجبی سەرمان بەرامبەر پێشەواکان .

وە نوسـەر باسـی سـێ شـیعاری کـردووە: حەج ، جهـاد ، و جـومعە ، لەوەی کە ئەو سـێ شـیعارە لەگەڵ پێشـەواکان دەکرێت ، وە پێچەوانەی نـاکەن وە یارمەتیشیان دەدرێت

لەسەری ، وە پێش ئەوەی بچین بۆ ناو تەفاصیلەکانی ئەو پرسە پێویستە بزانین ئایا لێرەدا مەبەست چییە لەپێشەواکان ؟

**وەلام:** کاربەدەستان و پێشەوایان دابەش دەبن بۆ سێ بەش :

1_ کاربەدەستانی دادپەرور: ئەوانە واجبە حەج و جیهاد و جومعەیان لەگەڵ ئەنجام بدرێت ، وە هاوشێوەی شەعائیرەکانی تریش .

2_ پێشەوایانی فاسق: ئەوانیش دابەش دەبن بۆ دوو بەش :

أ_ پێشەوایانی فاسق بەفسقێکی سنور بەزێن: ئەوانەش ئەوانەن کە ناو دەبرێن بە پێشەوایانی زوڵم و ستەم ، ستەم لەخەڵکی دەکەن لە ماڵ و سامانیان وە لە حوکمەکاندا زوڵم دەکەن بەلام موسڵمانن ، وە بەو ستەم و زوڵمە لەدین دەرنەچوون .

ب_ پێشەوایانی فاسق بەفسقێکی ئاسایی: وەك پێشەوایانی مەی خۆر و زیناکەر و سوو خۆر ، ئەوانە حاڵیان باشترە لەپێشەوایانی زاڵم و ستەمکار ، وە هەروەها هەردوو جۆرەکەش حەج و جیهاد و جومعەیان لەگەڵ ئەنجام دەدرێت .

3_ پێشەوایانی کافرەکان و عەلمانیەکان و هەڵگەڕاوەکان : ئەوانە هیچ یەکێك لەو هەقانەیان بۆ نییە ، سەبارەت بەنوێژی جومعە ئەوا دروست نییە لەدوایان بکرێت ، وە ئەگەر خەڵکی ناچار بکەن بۆ ئەوەی نوێژیان لەدوا بکەن ئەوا نوێژەکە دەکەن و دواتر نوێژەکەیان دووبارە دەکەنەوە ، وە بەهەمانشێوە نوێژی جەژن و نوێژەکانی تریشان لەدواوە ناکرێت ، وەك نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران و هاوەشێوەکانی و نوێژە فەرزەکان لەدوایان ناکرێت ، بەلام جهاد ئەوا واجبە جیهادیان بکەن ، وە واجبە لەسەر ئەهلی حەل و عەقد و زانایانی موسڵمانان جیهادیان بکەن و شەڕیان بەرامبەر بکەن بەو ڕادەیەی کە لەتوانایاندایە ، بەلام ئەگەر نەیانتوانی ئەوا واجبە کافرکردنیان و زانینی کافربوونیان ، وە بەپێشەوا دانەنانیان ، وە بەرگری نەکردن لێیان وە ئارام دەبین تاوەك الله فەرمانی خۆی دەنێرێت ، ( بۆ جیاکردنەوەی نێوان ناوەکان و حوکمەکان ) بەلام ئەگەر جهاد بەرپا بوو ، (جهادی بەرگری ، واتە ڕووبەڕووبونەوەی هێرشکەر ) وە ئالایان

بەرزکـردەوە ، وەك چـۆن دەولەتێـك هێـرش بکـاتە سـەر دەولەتێـك کەخەڵـکەکەی موسـڵمانن و کاربەدەسـتەکانیان کـافرە پاشـان ئەو کاربەدەسـتە کـافرە جهـادی دژ بەو هێرشکەرە ڕاگەیاند ، ئەوەیان ڕێگری تێدا نییە لەوەی جیهاد بکەیت دژی هێرشکەرەکە ، وەك پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی: ( الله ئەو دینە سەردەخات بە پیاوێکی تاوانبار ) [136] .

هەیە کە جهـاد لەگەڵ موسـڵمانان دەکـات ئـەگەر کاربەدەسـتەکەش کـافر بێـت مـادام مەسڵەحەت بۆ موسڵمانانە بۆ بەرگری کردن لێیان ، وە پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) هاوپەیمانی لەگەڵ جولەکە بەستووە یەکەمجار کە هاتە مەدینە لەسەر ئەوەی کە هاوپەیمـان بـن بـۆ بەرگـری کـردن لە مەدیـنە ، لەگەڵ ئەوەی کە جـولەکە کـافرن ، وە نمونەی ئەوەش ( پەیمانی الفضول ) پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) بەشداری کردووە لێی بۆ سەرخستنی ستەم لێکراوان ، وە باسێکی زیاتر و فراوانتر دێت بۆ ئەو باسە بە ویستی الله .
بەڵام حەج ، ئەوا ئەگەر کاربەدەستی کافر حەجی کرد ئەوا حەجی لەگەڵ دەکرێت .

وە وتەی نوسـەر ( **حەج کـردن دەبینـین لەگەڵیـان** ) دواتـر فەرمـووی ( **بەردەوامە** ) بە واتای ئەوەی کەوا واز ناهێنرێت لە ئەنجامدانی حەج بەهۆی کافرییەتی کاربەدەستەوە ، یاخود هەجر بکرێت یاخود هەجری مەککە بکرێت بەهۆی ئەوەی کەوا کاربەدەست کافرە ، وە هۆکاریش ئەوەیە کە حەج فەرزێکی واجبە ، نابێت وازی لێ بهێنرێت بەهۆی کافرییەتی کاربەدەستەوە ، **ئەمە بەڵگەی یەکەم** .

**بەڵگەی دووەم:** حەجکردنی ئەبوبەکر ، کاتێك کە حەجی ئەنجامدا پێش ساڵی دەیەمی هیجری ، لەگەڵ خەڵکیدا و کافرانیشی تێدابوو .

(136) رواه البخاري في صحيحه 1114/3 (ح2897), ومسلم 105/1 (ح111).

**بەڵگەی سێیەم**: وە هاوەڵان پێش فەتح كردنی مەككە حەجیان دەكرد بۆ مەككە لەگەڵ ئەوەشدا كە دەسەڵات لەمەككە بۆ كافران بوو ، بۆیە ڕێگرنەبووە لە ئەنجامدانی ئەو شیعارە ئەگەر كافریشی تێدا بێت .

**بەڵگەی چوارەم**: وتەی الله تعالى: ( **فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا** ) هۆكاری دابەزینی ئایەتەكە ئەوە بوو كە هاوەڵان دوودڵ بوون بۆ تەواوفی ڕاكردن بەسەفا و مەڕوا چونكە بتی تێدا بوو لەوكاتەدا ، بۆیە ئایەتەكە دابەزی بۆ نەهێشتنی دوودڵی لەوەی ڕاكردنەكە ئەنجام بدەن تەنانەت ئەگەر بت و شركی تێدا بێت .
وە نوسەر باسی عومرەی نەكردووە چونكە جیاوازە ، كاتێكی دیاریكراوی نییە وەك حەج بەڵكو كاتی ئەنجامدانی دەگەڕێتەوە بۆ كەسەكە ، ئەوكاتەی بیەوێت عومرە دەكات .

وە وتەكەی ( **جیهاد بەردەوامە** ) پێویستە هەڵویستەیەك بكەین لەسەر جیهاد ، مەبەستی پێی لەجهادی شەرعیە ، ئەوەیە كە بەردەوامە لەگەڵ پێشەوایان وە سەربازانی ئەهلی سوننەت بەشداری تێدا دەكەن ، وە ئەو جیهادەش یان جیهادێكی هێرش بردنە بۆ مەبەستەكانی ئیسلام ، یاخود جیهادی بەرگری لە نەفسی خۆیان و ماڵ و سامان و خێزانیان ، وە دژی جیهادی دونیاییە ، وە ئەوەش ئەوەیە كە پێشەوا شەڕ بكات لەپێناو ئەوەی بەزوڵم هەندێك وڵات و ناوچە بخاتە ژێر ڕكێف و دەسەڵاتی خۆیەوە ، وە وەك جیهاد كردن دژی موسڵمانان بە ستەم ، وە بۆ هەوا و ئارەزوو جیهاد بكات ، یاخود جیهاد بكات بۆ سەرخستنی كافران ، ئەوانە هەموو لەجۆری جیهادی دونیایین ، وە دروست نییە یارمەتی پێشەوا بدرێت لەسەری ، جا پێشەواكە موسڵمان بێت یان كافر ، تاوانبار بێت یان فاسق .

وە وتەكەی ( **وە ئەنجامدانی نوێژی جومعە لەدوایان دروستە** ) وتەكەی: لەدوایان ، چونكە لە عادەتی كاربەدەستان ئەوە بووە كە ئیمامی نوێژی جومعە بن ، وە ئەو عاداتانە لەو كاتەدا جیاواز بووە ، ئێستا زۆر بەكەمی دەبن بەپێشنوێژ ، وە حوكمەكە

دەگوازرێتەوە بۆ نوێنەرەکانی ، واتە ئەو کەسانەی دیاریان کردوون بۆ نوێژ دابەستن بۆ خەڵکی .
وە وتەی نوسەر ( **دروستە** ) مەبەستی لەوە بووە کە نوێژ کردن لەدوایان دروست و ڕاستە ، وە دروستیەتی یەکێکە لە پێنج حوکمەکە ، واتە نە واجبە وە نە سوننەتە ، بەڵام ڕێگا پێدراوە ، هەموو ڕێگاپێدراوێکیش سوودی ئەوەی لێوەردەگیریت کە نە حەرامە وە نە مەکروهە ، ئەوەشیان ئەگەر فەرمان نەکات و سزا نەدات یاخود نەچێت بۆ فەسادیەکی زیاتر ، بەڵام ئەگەر سزا بدرێت و بچێت بۆ فەساد ، ئەوا یان دەبێتە واجب یان سوننەت ، حوکمەکە جیاواز دەبێت .
وە قیاس دەکرێت بەسەر جومعە و نوێژەکانی تر وەك نوێژی دوو جەژنەکە و خۆرگیران و پاڕانەوە و فەرزەکان ، ئەمەشیان ئەگەر مزگەوتەکە یەك مزگەوت بوو ، بەڵام ئەگەر مزگەوتەکان زۆر بوون ، وەك ئەوەی لە مەدینە دوو مزگەوت هەبێت بۆ جومعە ، سوننەت وایە کە نوێژ بکات لەدوای ئیمامێکی دادپەروەر ئەگەر قورسی تێدا نەبێت .
وە هەندێك لە هاوەڵان وەك ابن عمر نوێژی لەدوای حجاج کردووە وە إبن مسعود نوێژی کردووە لەدوای عقبة .

وە وتەی نوسەر ( **ئەگەر چاکەکار بن یاخود تاوانبار بن** ) چاکەکار هی باشە بریتیە لە دادپەوەری ، وە فجور ( تاوانباری ) ئەوا نوسەر مەبەستی لێی چیە ؟ لەسەر ئەوە دادەمەزرێت کە مەبەستی لە زوڵم و ستەمە یاخود مەبەستی لە فسقە ، ئەوەشیان دروستە .
ئەوە ماوەتەوە ئەگەر ئەو فجوریەتە ( **تاوانکارییە** ) کوفر و هەڵگەڕانەوە بێت ئەوا لێرەدا تەفصیل و وردەکاری تێدایە ، هەندێك شتی لەگەڵدا دەکرێت و هەندێك شتی لەگەڵدا ناکرێت ، بەلام حەج ئەوا لەگەلی ئەنجام دەدرێت ، بەلام جیهاد ئەوا لەسەر تەفصیلەکەی پێشووە ، جیاوازی دەکرێت لەنێوان جیهادی هێرشبەری و جیهادی بەرگری و لەنێوان جیهادی شەرعی و جیهادی دونیایی لەسەر شێوەی پێشوو کاتێك کە لەسەر پێشەوایانی کافر قسەمان کرد .

بەلام ئەو شتەی کە نابێت لەگەڵیان بکرێت نوێژە ، دروست نییە نوێژ کردن لەدوایان ، وە ئەگەر لەخەڵکی دەدا و بەزۆر پێیانی دەکرد ، نوێژی لەدوا دەکەن و دواتر نوێژەکەیان دووبـارە دەکەنەوە ، وە بەڵـگەش بـۆ ئەوە هەڵوێسـتی سـەلەف و کردەوەیـانە لەگەڵ پێشـەوایان کە جەهمـی بـوون ئەوان نوێژیـان دووبـارە دەکـردەوە لەدوایـان وە نوێژیـان دەکرد پێش ئەوەی بێنە لایان .

وە إبـن سـحمان نەقڵـی کـردووە لە شـێخەکەی کـە بریتیـە لـە عبـداللطیف وەك دڵنیـاکردنەوەیەك بـۆی ( کۆدەنگی ئەهلـی زانسـتی نەقـڵ کـردووە لەسـەر تەکفیرکردنـی جەهمیەکان ، وە کۆدەنگیشیان لەسەر ئەوەی کە نوێژ ئەنجام نادرێت لەدوای کافرێکی جەهمیەوە ، دواتر فەرموویان وە جیاوازی دەکرێت لەنێوان ئەو کەسەی کە بەڵگەکانی پێگەشتووە کە وازهێنەرەکەی کافر دەکات و لەنێوان ئەو کەسەی کە هیچ هەستێك و ئاگـایەکی لـێ نیـیە ، وە ئەو وتەیە شـێخ الاسـلام وای بـۆ دەچێـت کە لەو باسـانەیە کە لەوانەیە شـاراوە بێـت لای هەنـدێك خەڵـك ) کشـف الشـبهتین لاپەڕە (20-21-65-66-97) ، دواتـر قیاسـی کـردووە بەسـەر جەهمیەکانـدا فەرمـووی: وە لەوانەیە ئیمانـداران ئەنجامی بدەن لەگەڵ غەیری ئەوان لە هەڵگەڕاوان ، ئەگەر شکۆ و دەولەتیان هەبێت وە بەڵگەکانیش لەسەر ئەوە ناسراوە و بەناوبانگە .

وە نوسەر پوختی کردۆتەوە لەسەر سێ شعائر وە شعائری تر ماوە وەك جێبەجێکردنی حەددەکان و هەڵسان بەدانانی سەنگەر و فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگریکردن لەخراپە .
**وەلامیش:** نوسەر مەبەستی لە کورتکردنەوەی نەبووە بەوەنـدە ، ئەگەرنا حوکمی ئەوانە وەك حوکمی جهاد و حەجە ، وە نوسەر باسی ڕۆژووشی نەکردووە ، سەبارەت بە ڕۆژوو ئەوا هاتووە لە فەرموودەی: ( ڕۆژو ئەو ڕۆژەیە کە بەڕۆژوو دەبن ) [137] ، بۆیە دەگوترێت: ئـەگەر هـاتوو پێشـەوا گرنگـی ئەدا بە ڕۆژوو و دەسـتی پێـوەدەگرت لەسـەر شـێوە شەرعیەکەی ئەوا لەگەڵی بەڕۆژوو دەبێت و فتار دەکاتەوە ( ڕۆژوو دەشکێنێت ) لەگەڵی

(137) رواه الترمذي في سننه 80/3 (ح697), والدارقطني في سننه 164/2 (ح35).

ئەگەر چاکەکار بێت یان تاوانبار بێت یان موسڵمان بێت یان کافر بێت ، بەلام ئەگەر گرنگی بەڕێگا شەرعیەکانی نەدەدا ، بەڵکو تەنها بەحساب ئەوا لێرەدا مرۆڤ دەست دەگرێت بەڕێگا شەرعیەکەی و شوێنی ناکەوێت ، ئەوە نەبێت ئەگەر بترسێت لەنەفسی خۆی لێی لە سجن کردن یاخود لێدانی ، ئەوا بەنهێنی بەڕۆژو دەبێت و فتار دەکاتەوە ، وە ئەگەر نەیتوانی لەسەر شێوەی شەرعیەکەی بڕوات ئەوا دروستە کە دەست پێبکات و کۆتایی پێ بێنێت لەگەڵیان بەهۆی گرنگی و پێویستی ئەنجامدانی ئەو شعائرە .

**سەبارەت بە زەکات** ، ئەگەر پێشەوایان لەکۆمەڵەی دادپەروەران بن ئەوا زەکاتیان پێ دەدرێت بەلام ئەگەر ستەمکار بن و بەو شێوەیە خەرجی نەکەن کە شەرعیە ، ئەوا دروستە ( تێبینی وشەی دروستە بکە ) پێیان بدرێت وەك چۆن إبن عمر زەکاتی خۆی ئەدا بەپێشەوایانی ستەمکار ئەوەش ئەگەر داوایان لێکرد ، بەڵام خۆی مەبەستی لێ نەبێت و نەچێتە لایان .
بەڵام ئەگەر کافر بن ، ئەوا دروست نیيە پێیان بدرێت ئەوە نەبێت ئەگەر لەنەفسی خۆی لێیان بترسێت وە فێڵ دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی هیچ شتێکیان پێ نەدات .

پاشان نوسەر باسی بەڵگەی کردووە لەسەر ئەو پرسە ئەویش فەرموودەکەی ئەنەسە بەمەرفوعی ، فەرمووی: ( سێ شت لە بنچینەی ئیمانە: ئینجا فەرمووی: وە جیهاد ماوە لەو کاتەی الله منی ناردووە تاوەك کۆتایی ئوممەتەکەم کەوا جەنگی دەجال دەکەن ، زوڵمی زاڵمێك لەکاری ناخات نە دادوەری دادوەرێك و ئیمان هێنان بە قەدەرەکان ) [138] أبو داود ڕیوایەتی کردووە .

**هەندێك ڕووداوی سەردەمیانە :**
لەپێشوودا نوسەر باسی ئەوەی کردووە کە مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بریتییە کە جیهادکردن لەگەڵ پێشەوایانی موسڵمانان جا ئەگەر چاك بن یان تاوانبار و

(138) رواه أبو داود 18/3 (ح2532).

خراپەکاربن ، ئەو پرسە هەندێك ڕووداوی سەردەمیانە بەدوای خۆیدا دێنێت ، ئەویش بەو شێوەیەیە :

1_ ئایا حوکمی چییە ئەگەر بەشێك لە سوپا تاوانبار و خراپەکار بن یاخود بیدعەچی بن ، ئایا بەشداری جهادیان لەگەڵدا دەکرێت ؟

**وەڵام:** بەڵێ ، چونکە وتەی نوسەر وایدەبینین کە جهاد ئەنجام دەدرێت لەگەڵ هەموو چاکێك و تاوانبارێك ، ئەوەشیان دەیگرێتەوە ئەگەر هاتوو تاوانبار و خراپەکارەکە پێشەوا بوو یاخود سەکردەی سوپاکە یاخود ئەگەر فاجرەکە و خراپەکارەکە شوێنکەوتەی هەبوو ، ئەوانیش هەندێك لە سوپان ، بۆیە ئەگەر جیهادی ئیسلامی بەرپا بوو ، ( تێبینی بکە گرێدانی بە جیهادی ئیسلامی ) ، وە سەرکردایەتییەکەی تاوانبار و خراپەکار بوو یاخود تاکی سوپاکە فاسق بوون یاخود تاواتبار و خراپەکار بن ، ئەوا هیچ ڕێگریەك نییە بۆ ئەنجامدانی جیهاد لەگەڵیان ، ئەوەشی ئەوە دەسەلمێنێت غەزوەی حونەینە کاتێك کە دوازدە هەزار کەس لەگەڵ پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) دەرچوون ، لەوانە دوو هەزاریان لە موسڵمانانی فەتح بوون ، لەدوو مانگ زیاتر بەسەر موسڵمان بوونیان تێنەپەڕی بوو ، تاوەك هەندێکیان گوتیان: ( ئەی پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) دارێکمان بۆ دابنێ شتی پێهەڵواسین ( بۆ تەبەڕووك ) ) [139] .

ئەوەشی ئەوە دەسەلمێنێت: کە لەهەندێك غەزوەکانی پێغەمبەری الله دا ( صلى الله عليه وسلم ) ، تاوانباران و خراپەکاران بەشدار بوون لەگەڵی ، وەك ئەو غەزوەیەی کە پیاوێك بەشداری تێدا کرد دواتر خۆی کوشت .

وە بەهەمان شێوە لە غەزوەی ئوحود کە دووڕووان بەشداریان تێدا کرد ، بەڵام ئەگەر تاوانباران و فاسقان و بیدعەچیان بەشداریان کرد لەگەڵمان ئەوا پێویستە ئامۆژگاریان بکرێت ، وە فەرمانکردن بەچاکە و ڕێگری کردن لە خراپە و ڕەتکردنەوەی سەرنەخەر لێیان وە پەککخەر و ڕق هەبوون بۆی و حەزەر کردن بەرامبەری .

(139) رواه الترمذي في سننه 475/4 (ح2180) , وأحمد في مسنده 218/5 (ح21947).

لەگەڵ ئاگادار بوون لەوەی ئەگەر داوای کافران بکات ( کە بەرامبەرەکەیان لاواز و شکاو بن لەسەر شێوەی تاك ) ئەوا دروست نییە جیهادیان پێ بکرێت لەگەڵمان ، وە ڕێز و عیزەت و گەورەیی هەر بۆ الله و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیە وسلم ) و ئیماندارانە ( ئەی چی بەکۆمەڵیان و پشت بەستن بە دەولەتەکان ؟ ؟ ؟ ) ، بەهۆی وتەکەی پێغەمبەر علیە السلام: ( بگەڕێوە پشت بەموشریك نابەستم ) [140] ، موسلیم ڕیوایەتی کردووە .

2_ وە وتەی نوسەر ( **وە ئەنجامدانی جیهاد بەدروست دەزانین لەگەڵ تاوانباران و خراپەکاران** ) لێرەدا جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەی پێشەواکە تاوانبار و خراپەکار بێت و لەگەڵ ئەوەی فجور ( **تاوانباری و خراپەکاری** ) مەبەستی ئاڵاکە بێت ، جیاوازیەکی گەورە هەیە لە نێوانیان ، جا ئەگەر پێشەواکە تاوانبار بوو بە واتای ئەوەی کە کوفری تێدایە نەبێت ، بەلام جیهادێکی شەرعی دەکات ، یاخود بۆ مەبەستە شەرعیەکان ، ئەوەشیان مەبەست لەوەیە کە جهادی لەگەڵدا بکرێت .
بەلام ئەگەر فجور ( **تاوانباری و خراپەکاری** ) لە ئاڵا و مەبەستەکەدا بێت ، بەواتای ئەوەی ئامانج لە جەنگەکە دونیایی بێت و بۆ شتی ناشەرعی بێت لێرەدا لەگەڵیان جەنگ ناکات ، مادام فجور ( تاوانباری و خراپەکاری ) لە ئاڵا و مەبەستەکەدا هەیە ، بەڵکو ئەگەر بۆ نموونە وامان دانا کە پێشەواکە دادپەروەرە ، بەلام مەبەست و ئاڵاکەی فاجرە ئەوا لەگەڵی جیهاد ناکرێت .

3_ ئەگەر کۆمەڵەیەك دروستکرا بۆ جیهادکردنی عەلمانیەکان واجبە لەسەر ئەهلی سوننەت یارمەتیان بدەن ئەگەر ئەو کۆمەڵەیە بیدعەچی و فاسق بن و هەڵسان بەجیهادکردن دژی حکومەتێکی کافر ، واجبە لەسەرمان یارمەتیان بدەین و سەریان بخەین بەو ڕادەیەی لە تواناماندایە بەگوفتار و کردار ، وە لەکاتی جیهادکردنیان بۆ عەلمانیەکان و کاربەدەستانی کافران ئەوا دەوەستین لە هێرشکردنە سەر بیدعەچی و

(140) رواه مسلم في صحيحه 1449/3 (ح1817), والترمذي في سننه 127/4 (ح1558).

فاسقان چونكه ئەو كاتە پێویستی بەكۆبونەوە و یارمەتی هەیە وە وەستان لە هێرشكردنە سەریان سەرخستێنێكە بەجۆرێك لە جۆرەكان وە هێرشكردنە سەریان سەر شۆڕكردنیانە بەجۆرێك لەجۆرەكان ، وە ئەوە ناگەیێنێت كە ئێمە بە بیدعەچی و گومڕایان نازانین ، بەڵكو بیدعەچی و گومڕان ، وە لەكاتی پارێزراوی قسە لەسەر بیدعەكەیان دەكرێت ، بەڵام ئەگەر هەوڵی جیهادیان دا واجبە یارمەتیان بدرێت ، وە ئەوەشیان هەمووی دەچێتە ناو وتەكەی نوسەر ( **وە جیهاد بەدروست دەبینین لەگەڵ هەموو چاكێك و تاوانبارێك** ) .

## بەشێك

**نوسەر فەرموویەتی:** وە لەسوننەتدا بریتییە لە دۆستایەتی کردنی هاوەڵانی پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) و خۆشویستنیان و باسکردنی چاکەکانیان و ڕەحمەت ناردن بۆیان ، وە داوای لێخۆشبوون بۆ کردنیان ، وە دەستهەڵگرتن لەباسکردنی خراپەکانیان و ئەو شتانەی کە لەنێوانیان ڕوویدا ، وە بڕوابوون بە فەزڵیان و ناسینیان بەوەی پێشکەوتەن ، الله تعالی فەرموویەتی: ( **وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ** ) وە فەرموویەتی : ( **مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ۖ** ) وە پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ( **جنێو مەدەن بە هاوەڵانم ئەگەر یەکێ لەئێوە بەئەندازەی چیای ئوحود ئاڵتون بکات بەخێر ناگات بە مشتی یەکێك لەوان و بەنیوەی مشتێکیش** ) .

## ڕوونکردنەوە :

پاشان نوسەر چووەتە سەر باسی خۆشویستن و دۆستایەتی هاوەڵان ئەوەش چەند پرسێك لەخۆ دەگرێت :

یەکەم: وتەکەی ( **لەسوننەتدا** ) مەبەستی لە سوننەت ئەوەیە کە دژی بیدعەیە وە مەبەستی لەو دەربڕینەی شەرعی نییە کە بەواتای ئەوەی بیکات پاداشت دەدرێت لەسەری وە ئەوەشی نەی کات سزا نادرێت ، بەڵکو مەبەستی لەوە بووە کە بریتییە لەڕێچکەی ئەهلی سوننە و جەماعە .

دووەم: وتەکەی ( **دۆستایەتی هاوەڵانی پێغەمبەری الله صلی الله علیه وسلم** ) مەبەستی لە دۆستایەتی بریتییە لەخۆشویستنی هاوەڵان ، خۆشویستنەکەش لێرەدا بە وتە و کردار و بیروباوەڕ و واجبە بەرامبەر هاوەڵان ، **دواتر نوسەر ئەو خۆشویستن و دۆستایەتیەی دابەش کردووە بۆ سێ بەش :**

أ__ خۆشویستنی  بیروباوەڕی .
ب__ خۆشویستنی کرداری .
ج__ خۆشویستنی گوفتاری .

بەڵام **خۆشویستنی بیروباوەڕی** ئەوە بریتییە لەوتەکەی نوسەر ( **وە بڕوابوون بەفەزڵیان و ناسینیان بەوەی پێشکەوتەن ، ئەوەشیان پێی دەگوترێت کە گوفتاری دڵ کە بریتیە لە زانست و ناسین** ) .

**خۆشویستنی کرداری:** نوسەر ئاماژەی پێداوە بە وتەکەی ( **وە خۆشویستنیان** ) ئەوەشی بەدوایدا دێت لەڕێزگرتنیان و ستایش کردنیان لەدڵەوە ، وە قسەمان کە دەڵێین کرداری ئەوا کردەوەی دڵیش دەگرێتەوە کە بریتییە لە خۆشویستن و ڕێزگرتن و پێشخستنیان ، وە بەهەمان شێوە کردەوەی ئەندامەکانی لاشەش دەگرێتەوە ، ئەویش بریتیە لەسەرخستنیان و شوێنکەوتنیان و ئەنجامدانی کردەوەکانیان .

**خۆشویستنی گوفتاری:** ئەویش بریتییە لەگوفتاری زمان ، وە ئاماژەی پێداوە بەوتەکەی ( **وە باسکردنی چاکەکانیان و ڕەحمەت ناردن بۆیان ، وە داوای لێخۆشبوون بۆ کردنیان ، وە دەست هەڵگرتن لەباسکردنی خراپەکانیان و ئەو شتانەی لەنێوانیان ڕوویدا** ) ئەوەشیان چوار شتە کە بەزمان دەگوترێت ، کە سێیان ئەرێ ییە و کردنی داواکراوە کە بریتین لەسێیەکەی ، وە یەکێکیان نەرێ ییە ، واتە نەگوتنی و ئەنجامنەدانی ئەویش بریتییە لەدەستهەڵگرتن لەوەی قسەیان لەسەر بکرێت ، وە تەنها دەستهەڵگرتن بەس نییە پێویستە ستایش کردنیان و ڕەحمەت بۆناردنیان و داوای لێخۆشبوون بۆ کردنیان .

**دواتر نوسەر باسی دوو بەڵگەی کردووە بۆ ئەوە :**

بەڵگەی یەکەم: وتەی الله تعالى کەوا فەرموویەی: ( **وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا .......** ) [141] .

(141) سورة الحشر: 10 .

بەڵگەی دووەم: وتەی الله تعالى: ( **مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ۖ** ) [142] ، ئەوەیان لە قورئان .
پاشان نوسەر باسی جنێودان بە هاوەڵانی کردووە ، وە هۆکاری باسکردنی جنێودان ئەوەیە چونکە جنێودان بەهاوەڵان دژی خۆشویستن و دۆستایەتی کردنیانە ، ئەوەی جنێو بەهاوەڵان یاخود بەیەکێکیان بدات ، ئەوەیان نەفی خۆشویستنی هاوەڵان دەکات ، سەبارەت بە حوکمی جنێودان بەهاوەڵان لەسەر ئەو شێوەیەیە :
1_ جنێو بەهەموویان یاخود بەزۆربەیان بدات ئەوەیان کافرە بە کۆدەنگی .
2_ جنێو بەهەندێکیان یاخود یەکێکیان بدات ، **ئەوەشیان دوو وتەی لەسەرە** :

**یەکەم**: جنێودان بە یەکێك یاخود دووان لە هاوەڵان لەوانەی بەناوبانگ و ناسراو نین جگە لە چوار خەلیفەکە و دە ( 10 ) مژدەپێدەراوەکە ، ئەوا کافر نابێت ، وە پشتیان بەستووە بەو فەرموودەی کە نوسەر باسی کردووە: ( جنێو بە هاوەڵانم مەدەن ......) [143] ئەوەشیان ڕێگرییە وە ڕێگری دەچێت بۆ ئەوەی حەرام بێت و باسی ئەوە نەکراوە کە کوفر بێت .
گوتویانە: بەهەمان شێوە خالیدی کوڕی وەلید قسەی لەسەر عبدالرحمنی کوڕی عەوف کردووە و بەو هۆکارە کافر نەبووە .
**دووەم**: جنێودان بەیەك هاوەڵ کافر دەبێت پێی بەو مەرجەی بزانێت کە ئەوەی جنێوی پێداوە هاوەڵە و پاشان کەلەڕەقی بکات ، ئەوەیان کافر دەبێت و ئەوەی ئەوەش دەسەلمێنێت وتەی پێغەمبەری الله یە ( صلی الله علیه وسلم ) کەوا فەرموویەتی: ( الله تعالی هاوەڵی پێم داوە وە هەندێکیانی بۆم کردووە بە وەزیر و زاوا ئەوەی جنێویان پێ بدات ئەوا نەفرەتی الله و مەلائیکەت و هەموو خەڵکی لەسەر بێت ) حاکم ڕیوایەتی کردووە [144] ، ئەوە بەڵگەی یەکەم .

---

(142) سورة الفتح: 29 .

(143) أخرجه البخاري 695/5 (ح3861), ومسلم 1967/4 (ح2540).

(144) مستدرك الحاكم 732/3 (ح6656).

بەڵــگەی دووەم: الله تعــالی باســی ئەوەی کــردووە کە لێیــان ڕازی بــووە ، الله تعــالی فەرمـوویەتی: ( **لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ** ) ، هەمـوو هـاوەڵان الله لێیـان ڕازی بـووە و لەئەهلی بەهەشتن ، وە الله تعالی فەرموویەتی: ( **يَوْمَ لَا يُخْزِي اللَّهُ النَّبِيَّ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ** ) وە مەبەست لە هاوەڵانە بە پلەی یەکەم .

جا ئەوەی جنێو بەیەك هاوەڵ بدات ئەوا ئەو ئایەتانە و هاوشێوەیانی بەدرۆخستۆتەوە ، ئەوەشیان دروستە بەوەی ئەوەی جنێو بەیەك هاوەڵ بدات کافر دەبێت دوای زانین و کەلەڕەقی کردن ، ئەوەشیان ئـەگەر جنێـودانەکەی جنێـوی ڕق و دژایەتـی بێـت وەك لە فەرمـوودەی ئەنصـاردا هـیچ کەس جنێویـان پـێ نـادات مەگەر کەسێکی دووڕو نەبێـت ، بەڵام جنێودانەکەی بەهۆی تەئویلەوە بێت ئەوا حوکمی وەك حوکمی پرسە شاراوەکانە ئەوکاتە کافر دەبێت ئەگەر تێگەشتبێت لەبەڵگەکان و کەلەڕەقی بکات .

وە ئەوەش ئەوەی بیـزانم وتەی ئیمـامی احمـدی کـوڕی حەنـبەلە وەك لە کتێبـی سـونەی عبـدالله دا ، ئەو کەســەی جنێــو بەیەك هــاوەڵ بــدات رافضــەیێکی پیســە الله تەوبە و فیـدیەی لێوەرناگرێـت ، وە أبـو زرعـە نـاوی کەسـی وای بـردووە بەزەنـدیق وەك خطیبـی بغـدادی لە ( الکفایــة ) لێـیەوە دەگوازێتــەوە ، وە یحیــی کــوڕی معـین نـاوی بـردووە بەدەجال ، وە فەرموویەتی: نەفرەتی الله و مەلائیکەت و هەموو خەڵکی لەسەر بێت .

**پرسێك: ئەو کۆمەڵانەی کە پێچەوانەیان کردووە کە خۆشویستن و دۆستایەتی کردنی هاوەڵان ، ئەوانیش خەواریجەکان و رافضەکانن :**

ئەوانە خۆشویسـتن و دۆسـتایەتیان بــۆ هــاوەڵان نیــیە ، بەڵام لەکــاتی ئێســتامان دا ســەردەمیەکان هەن ، وە بەشێکیشــیان عەلمانیەکــانن ، وە بەشــکیکی تریشــیان کە ناودەبرێن بە درۆزنەکان ( ئیسلامیە میانڕەوە نوێگەرییە ئەقڵانیەکان ، الله بەو شێوەیە پاداشـتیان بـداتەوە کە شایسـتەن ) ئەوانەش هێـرش دەکەنە سـەر هـاوەڵان بـەتـایبەت عوسمان و معاویە و عبدالله کوڕی زوبەیر و جگە لەوانەش .

## بەشێك

**نوسەر فەرموویەتی:** وە لەسوننەت ئەوەیە ڕازیبوون بۆ هاوسەرانی پێغەمبەری الله ( صلی الله علیە وسلم ) دایکانی ئیمانداران پاکەکان و بەریئەکان لەهەموو خراپەیەك چاکترینیان خەدیجەی کچی خوەیلەدە وە عائیشەی ڕاستگۆی کچی ڕاستگۆیە ئەوەی کە الله بەرائەتی ڕاگەیاند لە کتێبەکەیدا ، هاوسەری پێغەمبەری الله ( صلی الله علیە وسلم ) لەدونیا و لەقیامەتدا ئەوەی تۆمەتی بۆ هەڵببەستێت لەوەی الله بەرائەتی ڕاگەیاندووە ئەوا کافر دەبێت بە الله تعالی .

## ڕوونکردنەوە :

دواتر نوسەر باسی خۆشەویستی هاوسەرانی پێغەمبەری کردووە علیە الصلاة والسلام ، وە چەند باسێکی تێدایە :

**یەکەم:** وتەکەی ( **لەسوننەتدایە** ) :

مەبەستی پێی لە ڕێچکەی سەلەفە ، ئەوەی پێچەوانەی ئەوە بکات ئەوا بیدعەچیە ، وە سەبارەت بە هاوسەرانی پێغەمبەر ( صلی الله علیە وسلم ) ، ئەوە بەشێکی لێ باسرا لەپێشوودا ئەویش واجبمان بەرامبەر هاوەڵان ، ئەوانیش لەناو ئەو هەڵوێست و واجباتانەن کە لەپێشوودا باسکرا ، **وە ئەوەشی بۆ زیاد دەکرێت :**

1_ بڕوابون بەوەی ئەوان دایکانی ئیماندارانن .

2_ وە ئەوانیش پاکن و بەریئن .

3_ وە بڕوا بوون بەوەی ئەوان هاوسەرانی پێغەمبەرن لە دونیا و قیامەتدا .

دواتر نوسەر چووە بۆ سەر پرسی چاکترین هاوسەر لەنێوان هاوسەرەکانی پێغەمبەر علیە السلام .

**وە پرسەکەش خیلافیە لەسەر سێ وتە :**

ابن القیم باسی کردووە لە ( جلاء الأفهام ) ، وە سفارینی لەعەقیدەکەیدا :

وتەی یەکەم: چاکترینیان خەدیجەیە .

وتەی دووەم: چاکترینیان عائیشەیە .
وتەی سێیەم: هەڵنەبژاردن وەستان لەبەچاکتردانانی یەکێکیان .
وە وتەی چـوارەمیش هەیە کە ابـن القـیم باسـی نەکـردووە ، بەڵام هەنـدێك لە زانایـان باسیان کردووە کە چاکترینیان فاطیمەی کچی پێغەمبەرە علیە السلام .
بەلام نوسـەر ڕەحمەتـی الله لەسـەری بێـت وتەیەکـی ناوەنـدی هەڵبـژاردووە ، بـۆیە فەرموویەتـی ( **چاکترینیـان خەدیـجەی کچی خـوەیلەدە وە عائیشـەی ڕاسـتگۆی کچی ڕاستگۆیە** ) ، وە ابن تیمیە لە واسطیەدا هەمان بۆچوونی هەیە کەوا بەهیچ شێوەیەك هیچ یەکێك لەوەی تر بە چاکتر دانەنرێت ، بەڵام هەر یەکێکیان فەزڵی تایبەتی خۆی هەیە ، بەگوێرەی پێشووتر و سەرخستن ئەوا چاکترینەکە بۆ خەدیجەیە ، وە بەگوێرەی زانست و سودی گشتی چاکترینەکە بۆ عائشەیە ، وتەکەی ابن تیمیة وابن قدامة کۆتایی پێهات .
وە ئەوەش زیاد دەکەین کە بەگوێرەی ڕەچەلەك ئەوا چاکترینەکە بۆ فاطیمەیە .

**پرسـێك:** ئەوەیـان سـەبارەت بە خەدیـجە و عائیشـە ئەوەی مـاوەتەوە ئافرەتەکـانی تـری پێغەمبەری الله ـن ( صلی الله علیه وسلم ) وەك دایکی سەلەمەو حفصة......هتد ، ئایا چاکترین لەنێوانیان کامەیە ؟
**وەلام:** هیچ کەسێکم نەبینیوە قسە لەسەر ئەو بابەتە بکات ، هەموو چاکترین و باشترین بۆ عائیشە و خەدیجەیە و بێدەنگ دەبن لەوەندە ، وە ئەوەندەمان بەسە کە بەس بوو بۆ سەلەف کە بریتییە لە بێدەنگ بوون .

**پرسـێك:** هەر کەسـێك تـۆمەت بـداتە پـاڵ هاوسـەرانی پێغەمـبەری الله (صـلی الله علیـە وسلم) :
**وەلام:** کافر دەبێـت بەو تـۆمەت دانەپاڵەیـان و کـوفرێکی کرداری گەورەیە ، هەرکەسێك تۆمەت بداتەپاڵ یەکێکیان بە زینا یاخود غەیری ئەوە ، کافر دەبێت ، وە پێی ناگوترێت ئایا بیروباوەڕی دڵت چییە لەسەر ئەو تۆمەت و تانە دانەت لێیان .

**بەشێك**

**نوسـەر فەرمـوویەتی** : وە معـاویە خـاڵی ئیمانـدارانە وە نوسـەری وەحـی اللە یە و یەکـێکە لەخەلیفەکانی موسلمانان ، اللە تعالی لەهەموویان ڕازی بێت .

**ڕوونکردنەوە :**

پاشـان نوسـەر قسـەی لەسـەر معاویە کردووە اللە لێی ڕازی بێت وە هەڵوێسـت و واجـب بەرامـبەری ، وە پـێش ئەوەی باسـی ئەوە بکەیـن کەچـی پێویسـتە و واجـبە بەرامـبەری ، دەپرسین : بۆچی نوسەر بەتایبەت قسەی لەسەر معاویە کردووە ؟

**وەلام**: بـۆ ڕەت دانەوەی ڕافیضـە ئەوانەی کەقسـەیان لەسـەر معـاویە کـردووە وە شـتێکی تریش زیاد دەکەین بۆ ڕەتدانەوەی سەردەمییەکان و عەلمانیەکان و هاوبیرانیان ، چونکە ئەوانیش قسە لەسەر معاویە دەکەن .

**واجبمـان بەرامـبەر معـاویە** : لەپێشـدا باسـمانکرد ، ئەوەی واجـب و پێویسـتە بەرامـبەر هـاوەڵان ئەوا واجـب و پێویستیشـە بـۆ معـاویە ، چـونکە یەکـێکە لەوان ، بـۆیە نوسـەر هەندێك شتی زیادکردووە کە **پەیوەندی هەیە بە معاویەوە ئەویش بەو شێوەیە** :

1ـــ ئەو خـاڵی ئیمانـدارانە ، بەڵام تایبەتمەنـدیەك نییە تەنـها تـایبەت بێـت بە معـاویەوە ، بەڵکـو ـــ اللە ـش زانـاترە ـــ هەرکەسێك کە بـرای یەکێـك لە هاوسـەرانی پێغەمـبەری اللە بێـت ( صـلی اللە علـیە وسـلم ) ئەوا ئەو تایبەتمەنـدیە دەیگـرێتەوە وەك عمـر ئەو خـاڵی ئیماندارانە چونکە برای حفصەیە ، بەهەمان شێوە منداڵەکانی ابوبکر ، وە امامی الآجری لەکتێبی شەریعەدا معاویەی ناوبردووە بەخاڵی ئیمانداران .

2ـــ ئەو نوسەری وەحی اللە یە وە ئەو دەستپاك و ئەمینە .

3ـــ ئەو یەکێکە لەخەلیفەکانی موسلمانان .

وە حـوکمی ئەو کەسـەی جنێـو بـدات بە معـاویە لەپێشـتردا باسـمانکرد لەحـوکمی ئەوەی جنێو بە هاوەڵان بدات لەسەر شێوەی ڕوونکردنەوەکەی پێشوو .

## بەشێك

**نوسەر فەرموویەتی**: وە لەسوننەتدا بریتییە لەگوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ پێشەوایانی موسڵمانان و فەرمانڕەوایانی ئیمانداران چاکەکانیان و تاوانبارەکانیان تاوەك فەرمان نەکەن بەسەرپێچی الله چونکە هیچ گوێڕایەلیەك نییە بۆ هیچ کەسێك لەسەرپێچی الله دا .

ئەوەشی خیلافەت و دەسەلات بگرێتە دەست و خەڵکی لەسەری کۆك بن و پێی ڕازی بن یاخود بە زۆر و بەشمشێر زاڵ بێت بەسەریان تاوەك ببێتە خەلیفە و ناوبرا بەئەمیری ئیمانداران ئەوا گویڕایەڵی کردنی واجب دەبێت ، وە پێچەوانەکردنی حەرام دەبێت ، وە دەرچوون لێی لادانە لەکۆمەڵەی موسڵمانان .

## ڕوونکردنەوە :

پاشان نوسەر چووەتە سەر ئەوەی کەپێویست و واجبە بەرامبەر پێشەوایان و فەرمانڕەوایان ، وە چەند پرسێکی تێدایە :

**یەکەم**: ئەو حوکمە بۆ فەرمانڕەوا و کاربەدەستانی موسڵمانانە :

بەلام ئەگەر کاربەدەستان کافر و هەڵگەڕاوە و عەلمانی بن ، ئەوا نوسەر مەبەستی لەو جۆرە کاربەدەستانە نەبووە ، وە لەپێشووشدا باسکرا کە ئەگەر کاربەدەست کافر بێت یاخود عەلمانی ئەوا واجبە دەرچوون لێیان لەگەڵ هەبوونی توانا و هێز و ڕوونەدانی فەساد و ئاشوب ئەگەر سوپایەك هەبوو لەگومان تێپەڕبووبێت بۆ لەناو بردنیان .

وە ئەوەشی ئەوە دەسەڵمێنێت فەرموودەکەی عبادەی کوڕی صامت ـە کە فەرموویەتی : ( پەیمانماندا بەپێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی وە کە ململانێ نەکەین لەگەڵ کەسێك کە شایستەی فەرمانڕەوایی بێت مەگەر کوفرێکی ئاشکرای لێ ببینن ) [145] .

(145) أخرجه البخاري 2588/6 (ح6647), ومسلم 470/3 (ح1709).

ئەوە واتا و مەبەستی فەرمـوودەکەیە ، وە تێگەیشـتنی پـێچەوانەکەی ئەوەیە کە ئـەگەر کوفرێکی ئاشکرامان بینی ئەوا گوێڕایەلی و ملکەچیان بۆ نییە ، بەڵکو ململانێیان لەگەڵ دەکەین لەسەر ئەوە ، چونکە ئەوان شایستەی ئەوە نین .

**وە قاضی عیاض کۆدەنگی نەقڵ کردووە** لەسەر واجبێتی دەرچوون لەسەر کاربەدەستی کافر وە نەگـوێڕایەلی و نەملکەچی بـۆ هەیە ، أبـو یعلی و مـاوەردی نەقڵیـان کـردووە لە (الأحكام السلطانية ) وە نەووەویش لە ( شرحی موسلیم ) و ابن حجر لە ( فتح الباری ) .

بـۆیە نوسـەر فەرمـووی: بـۆ پێشـەوایانی موسـڵمانان و فەرمانڕەوایـانی ئیمانـداران ، وە باسـکردنیان بەو دوو صـیفەتە پێشـەوایانی کـافر و عەلمانیەکـان و بێـدینەکان و هاوشێوەکانی لێ دەردەچێت ، جا ئەگەر کافری ئەصلی بن یاخود کوفریان توشبوبێت .

**دووەم: واجب چییە بەرامبەر پێشەوا شەرعییەکان :**

نوسەر چوار شتی باسکردووە: دوو شتی واجب کردووە و دوو شتی حەرام کردووە :

**دوو واجبەکان :**

1_ گوێڕایەڵی کردنیان .

2_ ملکەچی بۆیان .

**بەڵام دوو حەرامەکان :**

1_ دەرچوون لێیان .

2_ پێچەوانەکردنیان .

وە وتەی نوسەر **چاکەکار و تاوانباریان** : چاکەکاری واتە باش ، بەڵام مەبەستی لەتاوانبار وە خراپەکار ئەو کەسەیە کە تـاوان و سـەرپێچیە گەورەکانی هەبێت ، جا ئەگەر بەکەمی هەبێت بێت یاخود بەزۆری جگە لەوەش وە بەمەرجی ئەوەی هۆکارێکی کوفری تـوش نەبوبێـت ، وە ئـەگەر تاوانییەکـەی تـاوانێکی کـوفر بـوو ، ئەوەیـان نـاچێتە ژێـر وتەکەی چونکە فەرمووی: پێشەوایانی موسڵمانان و فەرمانڕەوایانی ئیمانداران .

وه نوسـەر لێرەدا پێناسـەی ئەوەی کردووە کە کێ پێشـەوای موسڵمانانە یاخود ئەمیری ئیمانـدارانە ، وە ئەو کەسـە کێـیە کە ناودەبرێـت بە خەلـیفە ، فەرمـووی: **ئەوەیشـی خیلافەت و دەسەلات بگرێتە دەست و خەڵکی لەسەری کۆك بن و پێی ڕازی بن یاخود بەزۆر و بەشمشـێر زاڵ ببێـت بەسـەریان تـاوەك ببێـتە خەلـیفە** ، جـا بەو شـێوەیە خەلیفەکان دەبن بەدوو بەش :

أ_ ئەوەی خیلافەت و پێشەوایەتی بگرێتە دەست بەهەڵبژاردن و ڕازیبوونی خەڵکی ، وە مەبەستیشـی لە هەڵبـژاردن هەڵبژاردنـی ئەهلـی حەل و عەقـدە ، ئەوەشـیان چـاکترینی خەلیفەکانە .

ب_ ئەوەی خـیلافەت بگرێتەدەسـت بە هێـز و شمشـێر تـاوەك سـەرکەوێت بەسـەر خەڵکیـدا ، وە ناودەبرێـت بە پێشـەوای بەهێـز و سـەرکەوتوو ، ئەوەشـیان دانـدەنرێت بەخیلافەتەکەی ئەگەر بۆی چویە سەر .

## بەشێك

**نوسەر فەرموویەتی :**

وە لە سوننەتدا ئەوەیە کە هەجری ئەهلی بیدعە بکەیت و دوورەپەرێز بیت لێیانەوە و وازهێنان لە گفتوگۆ و ململانێ لەدیندا وە وازهێنان لەسەیرکردنی کتێبی بیدعەچیان و وازهێنان لەگوێگرتن لێیان و هەموو داهێنراوێك لەدیندا .

وە هەموو ناونراوێك بەجگە لە ئیسلام و سوننەت ئەوا بیدعەچیە وەك ڕافضەکان و جەهمیەکان و خەواریجەکان و قەدەریەکان و مورجیئەکان و موعتەزیلەکان و کەڕامیەکان و کەللابیەکان و هاوبیرانیان ئەوانە کۆمەڵەی گومڕایی و بیدعەن الله بمان پارێزێت لێی .

بەڵام سەبارەت بەئیمامەتی لەفروعەکانی دیندا وەك چوار کۆمەڵەکە ئەوا لۆمەنەکراوە چونکە ڕاجیای لە فروعدا ڕەحمەتە وە ڕاجیایانیش لەسەری سوپاسکراون لەسەری وە پاداشت دەدرێنەوە بۆ ئیجتهادەکەیان و ڕاجیاییان ڕەحمەتێکی فراوانە وە کۆدەنگیشیان بەلگەیەکی بڕاوەیە .

داواکارین لە الله کە پارێزراومان بکات لە بیدعە و فتنە و لەسەر ئیسلام و سوننەت بمان ژیێنێت و بمان کات لەو کەسانەی کە لە دونیادا شوێنکەوتەی پێغەمبەرن ( صلی الله علیە وسلم ) و بەڕەحم و فەزلی خۆی لەگەڵ کۆمەڵانی خۆی حەشرمان بکات لەدوای مردنمان آمین .

ئەوەش کۆتایی بیروبڕواکەیە وە سوپاس بۆ الله تعالى و سەڵات و سەلامێکی بێ پایەنی الله لەسەر پێشەوامان محمد ( صلی الله علیە وسلم ) و بنەماڵەکەی و هاوەڵانی .

**ڕوونکردنەوە :**

پاشان نوسەر باسی هەڵویستی بەرامبەر ئەهلی بیدعەت کردووە وە بابەتی دانەپاڵ ئیسلام و ناونانیان .

**وتەی یەکەم:** هەڵویست بەرامبەر ئەهلی بیدعە .

**ئەمەش چەند پرسێکی تێدایە :**

**پرسی یەکەم:** ناساندنی ئەهلی بیدعە :

مەبەستی لە ئەهلی بیدعە بریتیە لەوەی کەوا هەر کەسێك پەیوەست بێت بەبیروباوەڕەکەیەوە کە پێچەوانەی بیروباوەڕەکانی ئەهلی سوننە و جەماعە بێت ، مەبەستی پێ لە بیروباوەڕەکانە کە پێچەوانەیە بۆ بنچینەکانی ئەهلی سوننە و جەماعە نمونەی موعتەزیلەکان و ڕافضەکان و ئەشعەریەکان و مورجیئەکان ..... هتد .

**بۆیە نوسەر باسی هەشت کۆمەڵەیانی کردووە لە ئەهلی بیدعە ، ئەوانیش بەو شێوەیەن بەو شێوەیەی کە نوسەر باسیانی کردووە :**

1_ ڕافضەکان .
2_ جەهمیەکان .
3_ خەواریجەکان .
4_ قەدەریەکان .
5_ مورجیئەکان .
6_ موعتەزیلەکان .
7_ کەڕامیەکان .
8_ کەللابیەکان .

وە باسی کۆمەڵە گومڕاکانی ئەو سەردەمەش دەکەین لەسەر جیاکردنەوەی نێوانیان لە باسی تەکفیر لەوانە زەیدیەکان و بەهائیەکان و نصیرییەکان و قادیانیەکان و بابیەکان و باطنیەکان و ئیسماعیلیەکان و تیجانیەکان و مورجیئەکانی سەردەم و سەردەمیەکان و ئینهزامیەکان و جەماعەتی تەبلیغ و ئیخوان موسلمین و کۆمەڵەی هاوپەیمان لەگەڵ حکومەت و عەلمانیەکان وە حزبی تحریری ئیسلامی و خەواریجەکانی سەردەم ئەوانەی کە بەگشتی تەکفیر دەکەن بەبێ دەرچوونی هیچ کەسێك لێی ، وە ئەصل و بنچینە لەو کەسانەی ئیسلام نیشان دەدەن بەکوفر دەبینن یاخود تەوەقوف .

ئەوەشی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە نوسەر لەو باسەدا ئەشعەریەکانی نەهێناوەتەوە لەگەڵ ئەوەی کە بیدعەچین و لەسەردەمی خۆی بوون .
بەهەمان شێوە ماتوریدییەکان لەگەڵ ئەوەی کە لەسەردەمی ئەودا بوون ، وە لەگەڵ ئەو کۆمەڵانە بەشێکی تری کۆمەڵەی بیدعەچی سەردەمیانیش زیاد دەکرێت لەوانەی کە لەسەر بنچینە پێچەوانەی ئەهلی سوننە و جەماعە دەکەن .

**پرسی دووەم: جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەی کە دەڵێین بیدعەچی لەگەڵ ئەوەی کە بیدعەی تیایە :**

سەبارەت بەپیاوی بیدعەچی ئەو کەسەیە کە پەیوەست بووە بە بیروباوەڕێك لە بیروباوەڕەکانی کۆمەلەی بیدعەچیان لەوەی کە پێچەوانەیە بۆ بنچینەی ئەهلی سوننە ، بەڵام ئەوەی پێی دەگوترێت بیدعەی تێدایە ، ئەو کەسە لە ئەهلی سوننەت و جەماعەتە لە بنچینەکان ، وە بیروباوەڕەکانی وەك بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعەیە ، بەڵام توشی بیدعە بووە ، وەکو زیندووکردنەوەی نیوەی شەوی شەعبان ، وە وەکو بیدعەی بەنی ئومەییە وەك پێشخستنی خوطبەی جەژن بەسەر نوێژدا وە پەیوەست بوون بە درەنگ کردنی نوێژ بۆ کۆتایی کاتەکەی ، وە وەکو داهێنانی هەندێك زیکری دیاریکراو و هاوشێوەیان ، وە وەکو ئەو کەسەی صیفەتێك لەصیفەتەکانی الله پەکبخات بەبێ ملکەچ بوون بەبنچینەکانی پەکخستن لە صیفەتەکان یاخود هەندێکیان ، ئەوانە ناونانرێن بەبیدعەچی ، بەڵکو دەگوترێت کە ئەهلی سوننەن و بیدعەیان تێدایە ، وە ئەو بەشەی کۆتایی نوسەر مەبەستی لێ نییە ، وە قسەی ئەهلی سوننەیان لەسەر ناچەسپێت کاتێك کە باسی ئەهلی بیدعە بکەن .

**پرسی سێیەم: هەڵوێست چییە بەرامبەر ئەهلی بیدعە ؟**

نوسەر باسی دوو هەڵوێستی کردووە: هەڵوێستێك پەیوەستە بە قسەوە ، وە هەڵوێستێکیش پەیوەستە بە تێکەڵاوی کردن :

سەبارەت هەڵوێستی یەکەم: فەرمووی ( **وە لە سوننەتدا ئەوەیە کە هەجری ئەهلی بیدعەت بکەیت** ) وە مەبەستی لە هەجرکردن وازهێنانە لە قسەکانیان و سەلام لێکردنیان و پیرۆزبایی لێکردنیان ، وە هەموو قسەکردنێك لەگەڵیان بەڵگەیە بۆ دڵخۆشبوون و خۆشویستن و شتی تر .
بەڵام قسەی دونیایی ئاسایی ، وەکو ئەگەر گرێبەستێکی کڕین و فرۆشتنی لەگەڵ هەبێت یاخود بیەوێت مافێکی بگەڕێنێتەوە کە لایانە ، وەك ئەمانەت کە هەی بێت لای بیدعەچیەك یاخود قەرزێك ئەگەر قسەی لەگەڵ بیدعەچیەك کرد بۆ ئەوەی مافی خۆی وەرگرێت ئەوا ڕێگری تێدا نییە. پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) وەفاتی کردووە و شمشێر نەبڕاوەکەشی ڕەهن بوو لای جولەکەیەك .

سەبارەت بە هەڵوێستی دووەم: پەیوەستە بە وەستان و تێکەڵاوی کردن ، فەرمووی: ( **وە دووره پەرێزی کردن لێیان** ) دوورەپەرێزی هەڵوێستە بەواتای دوورکەوتنەوە ، واتە تۆ لەلایەك بیت و ئەوانیش لەلایەکی تر ، وە ئەویش بەواتای دوورکەوتنەوە دێت ، وە لەگەڵیان ناژیت لەیەك خانوو و شوێن .

وە ئەو دوو شتەش _ بڕینی قسەو و نەژیان لەگەلیان _ بەبنچینەیەك لەبنچینەکانی ئەهلی سوننە و جەماعە دادەنرێت لەو بابەتە ، وە ئەویش بنچینەیەکە لەو پرسە ، ئەوە نەبێت کە لەوانەیە کەسێك لەو بنچینەیە دەربچێت ئەگەر نەتوانێت یاخود زۆری لێبکرێت ، یاخود ناچار بوو بۆ ناچاریەکی شەرعی ئەوکات دروستە واز لەو بنچینەیە بهێندرێت بەشێوەیەکی کاتی تا ئەو کاتەی ڕێگرییەکەی لەسەر لادەچێت ، دواتر دەگەڕێتەوە سەر ئەو بنچینەیە .

وە نمونەیەکی تر: ئەگەر مەبەستی لەوە بێت بیدعەچیەکە شت وەربگرێت ، وە وایزانی کە هەق قبوڵ دەکات و قسەی لەگەڵ کرد یاخود لەگەڵی ژیا ئەوا ڕێگری تێدا نییە بەمەرجێك ئەمین بێت لەنەفسی خۆی ، **چەند بەلگەیەکیش ئەوە دەسەلمێنن** :

1_ ئەوەی جێگیربووە لە صحیحدا کە پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) سەردانی أبو طالبی کردووە بۆئەوەی بانگەوازی بکات بۆ لای الله ، ئەو فەرموودەیە بنچینەیەکە لە سەردانی کردنی کافران و بیدعەچیان ئەگەر گومانی هەق وەرگرتنی لێ دەکرا .
2_ ئەو فەرموودەی ئیمام احمد ڕیوایەتی کردووە کەپێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) سەردانی جولەکەیەکی کردووە بۆئەوەی بانگی بکات بۆ ئیسلام و موسلمان بوو .
3_ پێغەمبەری الله ( صلی الله علیه وسلم ) خەمی لە بازاڕی کافران دەخوارد لەمەککە و بانگەوازی دەکردن بۆ لای الله .
پاشان نوسەر فەرموویەتی: ( **وازهێنان لە گفتوگۆ و بەربەرەکانێ لەدیندا** - ترك الجدال والخصومات في الدين ) .
وتەکەی ( **ترك الجدال _ وازهێنان لەگفتوگۆ** ) ئایا ئەلیف و لامەکە بۆ گشتگیریە ، واتە مەبەست لێی کە بەیەکجاری واز بهێنێت لە گفتوگۆ تاوەك لەگەڵ موسڵمانانیش ؟ ، یاخود تایبەتە و مەبەستی پێ وازهێنانە لە گفتوگۆ لەگەڵ بیدعەچیان ؟ ، دووەم ، هۆکاری گەڕاندنەوەکەی دەربڕینەکە چونکە شێوەی دەربڕینەکە لەگەڵ بیدعەچیانە ، وە لەسەر ئەوەش ئەوە دەبێتە سێیەمین شت سەبارەت بە بیدعەچیان ، دوویان باسکرا کە ئەویش بریتییە لە بڕینی قسە لەگەڵیان و دوورکەوتنەوە لێیان .

وە ئەو سێیەمەش زیاد دەکرێت کە بریتییە لە وازهێنان لە دەمکەدەمکێ و گفتوگۆ لەگەڵیان ، وە مەبەست لێی وازهێنانە لە گفتوگۆ و قسەکردن لەگەڵیان ، وە ئایا ئەوە گشتگیرە بەپێی کەسەکان ، یاخود تایبەتە ؟
**وەلام**: لەسەر گشتگیریەکەی نییە ، بەڵکو کۆمەڵەیەك هەن پێویستە گفتوگۆ لەگەڵ بیدعەچیان بکەن و ئەوانەی تر گفتوگۆ ناکەن و وازی لێ دەهێنن .

سەبارەت بەو کۆمەڵەیەی کە گفتوگۆ دەکات لەگەڵیان بریتین لە زانایان و هەموو زانایەکیش نا ، بەڵکو زانایەکی شارەزا بەمەزهەبی ئەو بیدعەچیانە و زانا بەخاڵی لاواز و دژ بەیەکی لەمەزهەبەکەیاندا ، چونکە گفتوگۆ وەك ئازایەتی و ڕووبەڕووبوونەوەیە لەشەڕ و

کوشتار دا ، بەو هۆیە دروست نییە ڕووبەڕوو ئەگەر دوو سوپا بەیەك گەیشتن مەگەر ئەوەی بەهێز و ئازا و ڕاهێنراو نەبێت لە ڕووبەڕووبوونەوە .
سەبارەت بەوانەی تر کە وازدەهێنن لە گفتوگۆ کردن وەك ناشارەزایانی ئەهلی سوننە وە گەنجانی پێگەشتوو ، وە فێرخوازانی زانست کەتەواو شارەزا و ڕۆچوو نین و و نمونەی ئەو جۆرە کەسانە .
**بەلام حوکمی گفتوگۆکردنی بیدعەچی فەرزی کیفایەتە** ئەو کەسەی کەبەتەنها هەڵبستێت پێی و بەس بێت ئەوا لەسەر ئەوانی تر لادەچێت ، وە واجب وایە زیاتر دیاری بکرێت بۆ ئەو باسە ، ئەگەر بیدعەیان زیاتر بلاوکردەوە لەترسی ئەوەی ئیمانداران توشی فیتنە ببن ، وە سەلەف ڕەتی ئەهلی بیدعەیان دەدایەوە وەك کتێبی (الرد على الجهمية ) دانراوی احمد بن حنبل ، وە ( الرد على الجهمية ) و ( الرد على بشر المريسي ) ی ئیمام الدارمی .
وە وتەی نوسەر ( **بەربەرەکانێ کردن لەدیندا - والخصومات في الدين** ) واتە ، لەسونەتە وازهێنان لە ململانێ وە بەربەرەکانێ لەدیندا ، ئەوەشی دیارە _ الله ـش زاناترە _ واوی عطف لە وشەی ( الخصومات ) بریتییە لە عطفی وازهێنان ، بەو شێوەیە وتەی نوسەر بەو شێوەیەی لێ دێت: لە سونەتدا بریتییە لە وازهێنان لە گفتوگۆ و ململانێ و بەربەرەکانێ لەدیندا .
لەسەر ئەوەش پێویستە جیاوازی بکرێت لەنێوان گفتوگۆ و بەربەرەکانێ ، بەو شێوەیە گفتوگۆ دەبێتە _ الله ـش زاناترە _ ئەوەی کە واز لە گفتوگۆی لەناکاو و سەربەخۆ بهێنرێت لەگەڵیان ، بەڵام ململانێ و بەربەرەکانێ ئەوەیە کە کەسێك دیاریبکرێت و خۆی ئامادە بکات بۆ گفتوگۆ و داوا لە بیدعەچیان بکات بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵیان ، بەو شێوەیەش ململانێ و بەربەرەکانێ تایبەتترە لە گفتوگۆ کردن .

وە وتەی نوسەر ( **لەدیندا** ) ئایا مەبەست لەوەیە کە گفتوگۆ لەگەڵ موسڵمانان نەکات ، چونکە ڕق و کینە لەنێوانیان بەرپا دەکات ، یاخود مەبەست لە ململانێ و بەربەرەکانێ و گفتوگۆیە لەگەڵ بیدعەچیان ؟

**وەڵام:** هەردوو مەبەستە لەخۆ دەگرێت ، وە مەبەستەکەی لەدووەم نزیکترە ، واتە وازبهێنرێت لە ململانێ لەگەڵ بیدعەچیان ، مەگەر ئەوەی لێیەوە دەرچێت ، ئەوەشیان پێویستی بەهەبوونی کۆمەلەیەکی بەتوانایە بەشێوەیەکی زانستیانە هەڵسن بەگفتوگۆکردن لەگەڵ بیدعەچیان ، وە پیشەیان بەدواداچوون بێت بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵ بیدعەچیان و بەرەنگاربوونەوەیان .

وە وتەی نوسەر ( **لەدین دا** ) تێگەشتنێکی وای نییە وە واتای ئەوە نییە کە گفتوگۆ و ململانێ لەدیندا نەکەن و لەسەر دونیا بیکەن ، بەلکۆ وەڵامەکە بەو شێوەیە نییە ، بەڵکو وتەکەی لە دیندا ، ئەوە گرێدانێکە بۆ ڕوونکردنەوەی واقع ، وە تیگەشتنێکی وای نییە .

پاشان نوسەر باسی کتێبەکان و وانەکان و تۆمارکراوەکانی ئەهلی بیدعەی کردووە .
فەرموویەتی: ( **وە لەسونتەتدا وازهێنانە لەسەیرکردنی کتێبی بیدعەچیان و وازهێنان لە گوێگرتن لێیان** ) .
وە قیاس دەکرێت بەسەر گوێگرتن ، گوێ لە تۆمارکراوەکانیان ناگرێت ، وە بینینیش ، سەیری تۆمارکراوەکانیان ناکات بەئامێرەکانی سەیرکردن ، وە باسێکی تریش قیاس دەکرێت لەسەری باسێکی سەردەمی ئەویش بریتییە لە سەیرنەکردنی کتێبی عەلمانیەکان و تۆمارکراوەکانیان و ڕۆژنامەکانیان ، وە بەهەمان شێوە ئامرازەکانی ڕاگەیاندنیان کە گوێی لێدەگیرێت لە ڕادیۆ یاخود تیقیەکان .

**بەڵام هۆکاری ڕێگری لەسەیرکردنی کتێبەکانی بیدعەچیان ، بەهۆی چەند هۆکارێکە :**
1_ ترسی توشی فتنەبوون و کاریگەری هەبوون لەسەر .
2_ چونکە سەرقاڵت دەکات لە ئەنجامنەدانی شتێك یان واجب یان لەو چاکتر .
3_ دەبێتە هۆی جوانکردنی بۆیان و زیادکردنی گەورەیان و یارمەتیدانیان بۆ بڵاوبونەوەی کتێبەکانیان ، بەڵگەش لەسەر ئەوە ، پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) ڕێگری لە عومەری کوڕی خطاب کرد کاتێك کە بینی تەورات دەخوێنێتەوە .

وە سەیرکردنی کتێبەکانی عەلمانیەکان و ڕۆژنامەیان و ئامادەبوون لە کۆبونەوەکانیانیش قیاس دەکرێت بەسەر ئەوە بەهۆی ترسی ئەوەی کاریان تێ بکات ، وەك چۆن ئەمڕۆ گەنجەکان ڕۆژنامەکانیان و ئەو کوفریانەی تێیاندایە کاریان تێکردوون .

پاشان نوسەر باسی هەڵوێستی بەرامبەر بیدعەچیان کردووە ، بەڵام هەڵوێست بەرامبەر بیدعە ، وە هەڵوێست بەرامبەر بیدعە واجبە وازلێهێنانی و دورکەوتنەوە لێی ، وە ڕێکخەری بیدعە نوسەر باسی کردووە ، فەرمووی: ( **هەموو داهێنراوێك لەدیندا بیدعەیە** ) وە وتەکەی ( **لە ديندا** ) ئەوەیان گرێدانێکی گرنگە ، چونکە لەداهێنراوەکانی دونیا دەچێتە دەرەوە ، وە ئەوەی دروستە کە ناونابرێت بە بیدعە ، وەك ڕێگاکانی دروست کردنی خانوو ئەگەر بەرێگایەکی جگە لەرێگای هاوەڵان دروست کرا ناونابرێت بە بیدعە ، وە وەك ئامرازەکانی پەیوەندی ناونابرێت بە بیدعە ، بەڵکو مەبەست لە بیدعە لەدینە ، وەکو زیندووکردنەوەی نیوەی شەوی شەعبان ، وە وەکو زیکرکردن بە کۆمەڵ ، وە بیدعەکانی جەنازە و و جەژنەکان ..... هتد .

**پاشان نوسەر باسی بابەتی خۆدانەپاڵ و ناولێنان و ئینتیمای کردووە .**

وە دابەشی کردووە بۆ دوو بەش :

**بەشی یەکەم: خۆدانەپاڵێکی بیروباوەڕی:** وە ڕێکخەری ئەوەش ئەوەیە کە ئەوەی خۆی دابێتەپاڵ کۆمەڵەیەك کە بیروباوەڕێکی پێچەوانەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعەی هەبێت .

سەبارەت بەوەیان ئەوا حوکمەکەی بریتییە لەوەی حەرامە و دروست نییە ئەوەشی ئەنجامی بدات بیدعەچییە و حوکمی وەك حوکمی ئەو کۆمەڵەیە کە خۆی داوەتە پاڵی .

جا ئەگەر بیدعەکەی بیدعەیەك بێت کوفر نەبێت وەك مورجیئە و کەللابیەکان و کەڕامیەکان ئەوەیان بیدعەچییە و کافر نابێت .

بەلام ئەگەر خۆی دایەپاڵ کۆمەڵەیەك کە بیدعەکەی کوفری بێت وەك ڕافضە و جەهمیەکان و قەدەریەکان و نوصەیریەکان و دوزیەکان ( ابن تيميه فەتوای لەسەر

کافربونیان داوە لە فەتوایەکی بەناوبانگ ) وە قادیانیەکان ( زانایانی پاکستان فەتوایان لەسەر کافربوونیان داوە ، وە زانایانی رابطەی عالەمی ئیسلامی ) وە بەهائیەکان و بابیەکان و باطنیەکان ( مجمع الفقهي الإسلامي فەتوای کافربوونیان لەسەریان داوە ) وە بەهەمان شێوە خۆ دانەپاڵ عەلمانیەکان بەهەموو جۆر و بەشەکانیانەوە لە شیوعیەکان و ئیشتراکیەکان و سەردەمیەکان و پەرلەمانیەکان و دیموکراسیەکان و نەتەوەپەرستەکان......هتد ، حوکمی وەك حوکمی ئەوانە ئەگەر مەزهەب و کوفرەکانیان بزانێت .

وە نوسەر باسی هەشت کۆمەڵەی کردووە کە خۆدانەپاڵیان بیدعەیە ، ئەوانیش: رافضەکان ، جەهمیەکان ، خەواریجەکان ، قەدەریەکان ، مورجیئەکان ، موعتەزیلەکان ، کەڕامیەکان ، کەللابیەکان .

وە نوسەر ئەو دوو کۆمەلانەی وەصف کردووە بەدوو وەصف :

1_ بەوەی کۆمەلەی گومڕا و سەرلێشێواون .

2_ بەوەی کۆمەڵەی بیدعەن .

وە نمونەی ئەمڕۆش خۆدانەپاڵ کۆمەڵە بیدعەچیەکانی تری سەردەم لەسەر ڕوونکردنەوەکەی پێشوو ، وە نوسەر مەبەستی لە کورت کردنەوەی نەبووە لەوەندە ، هەر بۆیە فەرمووی وە هاوبیرانیشیان ، وە لەهاوبیرانیشیان : ئەشعەریەکان و زەیدیەکان و فەلسەفیەکان و ئیسماعیلیەکان و بەهائییەکان و قادیانییەکان و نوصەیریەکان و تیجانیەکان ، وە ئیباضیەکان ، وە لەکۆمەڵە سەردەمیەکان کە بیروباوەڕیان هەیە وەك: عەلمانیەکان و دیموکراسیەکان و سەردەمیەکان و نەتەوەپەرستەکان و صۆفیەکان و بەعسیەکان ....... هتد .

**بەشی دووەم: بریتییە لە خۆدانەپاڵی فقهی** بۆ ئیمامێك لە گەورە ئیمامەکانی دین ، وەك خۆدانەپاڵ ئیمامی احمد و مالك و شافعی و أبو حنیفە ، ئەوەیان نوسەر بەدروستی داناوە و فەرمووی: هیچی تێدا نییە و فەرمووی لۆمە نەکراوە ، وە ابن تیمیة هەڵیبژاردووە

له كتێبەكەیدا ( الوصیة الكبرى ) ئەوە نەبێت كە **خۆدانەپاڵ چوار مەزهەبەكە ڕاجیایی تێدایە لەسەر دوو ووتە :**

**وتەی یەكەم**: وتەی هەندێك لە ئەهلی حدیث كە بریتییە لەحەرامیەتی خۆدانەپاڵ هەر یەكێك لە چوار ئیمامەكە و هاوشێوەیان ، وە گوتیان: خۆدانەپاڵی فقهی وەك خۆدانەپاڵی بیروباوەڕیە .

وە پشتیان بەچەندین بەڵگە بەستووە :

1ـ وتەی الله تعالى : ( **وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا** ) (146) .

ڕووی سەلماندنەكە: ئەوەیە كە خۆدانەپاڵی فیقهی دووبەرەكی و لێكترازانە .

2ـ وتەی الله تعالى : ( **وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُوا** ) (147) .

ڕووی سەلماندنەكە: ئەوەیە كە خۆدانە پاڵی فقهی دووبەرەكەی وگروپ گروپێنیە.

3ـ وتەی الله تعالى : ( **إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ** ) (148) .

ڕووی سەلماندنەكە: ئەوەیە كە خۆدانەپاڵی فیقهی دووبەرەكی و لێكترازانە .

4ـ بەوەی سەدە پیرۆزەكان تێپەڕین و هیچ خۆدانەپاڵێكی فیقهی تێدا نەبووە ، بۆیە لە بیدعە داهێنراوەكانە .

5ـ گوتیان وەك داخستنێك بۆ ذریعة ( ذریعة: بریتییە لەو شتانەی كە ڕێگاپێدراون بەڵام هۆكارێكن بۆ ئەنجام دانی حەرام ) ، وە دەبێتە هۆی دابەشبوون و لێكترازان .

**وتەی دووەم**: بریتییە لەوەی خۆدانەپاڵی فیقهی دروستە ، ئەوەش هەڵبژاردنی نوسەرە لێرەدا ، وە ابن تیمیةش هەڵیبژاردووە لە (الوصیة الكبرى) وە ئەوەش هەڵبژاردنی هەموو ئەوانەیە كە خۆیان داوەتەپاڵ چوار ئیمامەكە ، ئەوە نەبێت كە مەرجی ئەوەیان داناوە كە بەبێ گروپ گروپینی و دەمارگیری بێت ، ئەگەر بووە هۆكاری ئەوانە ئەوا حەرامە .

گوتیان: بەڵگەی وتەی یەكەم لەسەر دەمارگیری دادەمەزرێت .

(146) سورة آل عمران: 105 .

(147) سورة آل عمران: 103 .

(148) سورة الأنعام: 159 .

وە پشتیان بەستووە: بەوەی هەندێك لە هاوەڵان فەرموویان: وای بۆ موهاجیرەکان ، وە هەندێکتریان فەرموویان: وای بۆ ئەنصارەکان ، پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وسلم ) توڕەبوو ، وە ئەو کارەیانی بەبانگەوازی نەفامی ناوبرد لەگەڵ ئەوەی ناوبردن بە ئەنصار و موهاجیران ناوێکی ئیسلامی دروستە ، بەلکۆ لەناوەکانی ستایش وب ەرزیە ، بەلام کاتێك کە بۆ لێکترازان و گروپ گروپ هاتە قۆستنەوە بووە حەرام .

**پرسێك :**

باسێکی سەردەمی ماوە نوسەر قسەی لەسەر نەکردووە ئەگەر هەندێکیشیان لەسەردەمی خۆیدا هەبێت وەك خۆدانەپاڵ هۆز و ناوچە و دەولەت و دەسەڵاتداران و کۆمەلان .

هۆزەکان وەکو: تمیمی و هاوشیوەی ، وە ناوچەش وەك: نەجدی ، وە دەولەت وەك: مصری و یەمەنی .

وە بنەماکەش ئەوەیە کە هەموو خۆدانەپاڵێك ببێتە هۆکاری حەرام یاخود کوفر یاخود درۆ یاخود دۆستایەتی حەرام یاخود گروپ و دەمارگیری و یاخود مداهەنە ئەوا حەرامە .

بەڵام ئەو خۆدانەپاڵەی کە بریتییە لە نەسەب ئەوەیان واجبە و حەڕامە وازلیهێنان لە خۆدانەپاڵ باب و باپیرانی یاخود هۆزەکەی مەگەر عوزرێکی شەرعی هەبێت ، لەبەر فەرموودەی: ( ئەوەی خۆی بداتەپاڵ جگە لە باوکی ئەوا کافر بووە ) (149) .

پاشان نوسەر کۆتایی بەکتێبەکەی هێناوە بە پرسێك ئەویش بریتییە لەوەی ئایا ڕاجیایی لە فروعدا لۆمە کراوە یاخود مەدح کراوە ؟ وە ئایا ڕەحمەتە یاخود نا ؟

فەرمووی: ڕاجیای لە فروعدا ڕەحمەتە وە ڕاجیایانیش لەسەری سوپاس کراون لەسەری وە پاداشت دەدرێنەوە بۆ ئیجتهادەکەیان و ڕاجیاییان ڕەحمەتێکی فراوانە وە کۆدەنگیشیان بەلگەیەکی بڕاوەیە .

(149) أخرجه البخاري 2485/6 (ح6385)، ومسلم 79/1 (ح61) .

داواكارین له الله كه پارێزراومان بكات له بیدعه و فتنه و لەسەر ئیسلام و سوننەت بمان ژیێنێت و بمان كات لەو كەسانەی كه له دونیادا شوێنكەوتەی پێغەمبەرن ( صلى الله عليه وسلم ) و بەرەحم و فەزڵی خۆی لەگەڵ كۆمەڵانی خۆی حەشرمان بكات لەدوای مردنمان آمین .

**ئەوەش كۆتایی بیروباوەڕەكەیە وە سوپاس بۆ الله تعالى و سەڵات و سەلامێكی بێ پایەنی الله لەسەر پێشەوامان محمد ( صلى الله عليه وسلم ) و بنەماڵەكەی و هاوەڵانی .**

وتەكەی: ڕاجیاییان ڕەحمەتە واتە فراوانییە لەسەر ئوممەتی محمد بەواتای ئەوەی شوێن یەكێك له زانایانی موجتەهید و خاوەن پێگه ، وە به واتای ئەوەی كه خەڵكی ملكەچ ناكرێن بۆ شوێنكەوتنی یەك موجتەهید ، وە مەبستیشی له خەڵك ناشارەزایانن و هەموو كەسێك و خەڵكێك كه پێگەی ئیجتهادیان نییە .

وە لەواتاكانی ئەوەیە كەئەگەر مرۆڤ شوێن ئیمامێكی موجتەهید و خاوەن پێگه كەوت و قسەی ئەو ئیمامە بە گوێرەی واقع هەڵەبێت ئەوا عوزری بۆ هەیە لەوە و ئەوەش له ڕەحمەتە ، بەڵام ئەگەر ڕاجیایی سەریكێشا بۆ گروپ گروپێنی و دەمارگیری و سەریكێشا بۆ ستەمكاری و دەستدرێژی یەكێكیان لەسەر ئەوەی تر ، ئەوەیان ڕەحمەت نییە بەلكو سزا و گوناهە .

وە وتەكەی: ( **داواكارین له الله كه پارێزراومان بكات له بیدعەو فتنه و لەسەر ئیسلام و سوننەت بمان ژیێنێت و بمان كات لەو كەسانەی كه له دونیادا شوێنكەوتەی پێغەمبەرن ( صلى الله عليه وسلم ) و بەڕەحم و فەزڵی خۆی لەگەڵ كۆمەڵانی خۆی حەشرمان بكات لەدوای مردنمان آمین** ) .

## ڕوونكردنەوە :

دواتر نوسەر كتێبەكەی كۆتایی پێهێناوە بە پاڕانەوە :

یەكەم: داواكردنی پارێزراو بوون له بیدعه و فیتنه بۆ خۆی و بۆ هەموو موسڵمانان .

دووەم: پاڕانەوەی داواکردنی ژیان لەسەر ئیسلام و سوننەت .
سێیەم: پاڕانەوە بەوەی ببێتە شوێنکەوتوانی محمد لەدونیا و قیامەتدا .
دواتر کۆتایی پێ هێناوە بە: سەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەرمان محمد ( صلى الله عليه وسلم ) و لەسەر بنەماڵەکەی و هاوەڵانی .
ڕوونکردنەوەی ئەوەی مەبەست بوو کۆتایی پێهات و سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان .

## ناوەڕۆكی گشتی